د. عوسمان محەممەد غەریب

# یادی مەولوود

## لە دیدی زانایاندا

خوێندنەوەیەکی
بابەتیانە بۆ دەربڕینی
خۆشیی و یادکردنەوەی
یادی لە دایکبوونی
خۆشەویستمان
محەممەد ﷺ.



# یادی مەولوود

## لە دیدی زانایاندا

خوێندنەوەیەکی بابەتیانە بۆ دەربڕینی
خۆشیی و یادکردنەوەی یادی لە دایکبوونی
خۆشەویستمان محەممەد ﷺ.

نووسینی
د. عوسمان محەممەد غەریب





ناوی بەرهەم: یادی مەولوود لە دیدی زانایاندا

نووسینی: د. عوسمان محەممەد غەریب

نۆبەی چاپ: یەکەم – ٢٠١٦

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە

سپاردنی (١٩٠٣)ی ساڵی (٢٠١٦ )ی پێدراوە

﴿ لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾ ﴾ آل عمران: ١٦٤

﴿ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾ يونس: ٥٨

# دەسپێک



الحمـد لله رب العـالمين، والصـلاة والسـلام على سـيدنا محمد وعلى آلـه وصحبه ومن سار على هديه أجمعين:

مەمـوو سـاڵێک بە تـایبەت لە مـانگی مەولـوودی فەخـری کائیناتـدا لە نێوان موسڵماناندا کێشەیەک زیندوو دەکرێتەوە و، دەبێتە هۆی دووبەرەکیی و، تۆمەتبـارکردنی یەکـدی و، بەرجەسـتەکردنی فەلسـەفەی ڕق و کیـنە بەرامبەر بە یەکتر و، لەگۆڕنانی فەلسەفەی خۆشەویستی و ئەوین، ئەویش کێشەی ڕەوا بوون و حوکمی مەولوودی پێغەمبەرە –درووودی خودای لەسەر بێت -.

بەڵام زۆر بەداخەوە موسـوڵمانان لەم کێشـەدا دوو لا و جەمسـەری ڕاسـت و چەپی دژە یەکیـان گرتـووە، لایەکیـان بە مەمـوو شـێوەیەک دەڵـێن: مەولـوود دروسـتە و، دژایەتییەکی زۆری ئەوانەش دەکەن کە دەڵێن دروست نیـیە و، بەوە تۆمەتباریـان دەکەن کە خۆشەویسـتیی پێغەمـبەر –درووودی خـودای لەسـەر بێـت - لە دڵیانـدا نیـیە و، ڕقیـان لە پێغەمـبەرە بـۆیە دەڵـێن دروست نییە .

لایەنـی دووەمـیش بە هەمـوو شـێوەیەک بەلایـانەوە دروسـت نیـیە و بیـدعەیە و، لایەنی بەرامبەر بە موبتەدیع و گـومڕاو سـەرلێشـێواو دەزانـن و، خـۆم گـوێم لە مامۆسـتایەکی ئاینیـان بـوو لە کەنـاڵێکی ئاسـمانیدا دەیگـوت: حـوکمی ئەو کەسـانەی کە مەولـوود بە دروسـت دەزانـن ئەوەیە دارکـاری بکـرێن، مەندێکیشـیان ئەم بـابەتە بەرەو ئاقـارێکی وا دەبەن کە گونـاهی مەیخواردنەوە لە خواردنی چکلێتێکی مەولوود کەمترە.!! واتە گوناهی خـواردنی چکلێتێکی مەولوود لە گوناهی مەیخـواردنەوە گەورەترە.

ئێمە لێرەدا دەمانەوێت بەشێوەیەکی هێمنـانە و ئەکادیمیـانە بچینـە نێـو ئەو بـابەتە و، تەنهـا داوای یـارمەتیی لە پەروەردگـار دەکەیـن، خـودای گەورە لەو کێشـانەی کە ڕای جیاوازیـان لە سـەرە مەقمـان پیشـان بـدات و، یارمەتیمـان بـدات کە مەق بخەیـنە سـەر سـەرمان و شـوێنی بکەویـن و، لە ناهەق دوورمان بخاتەوە. آمین یا رب العالمین.



# چەند خاڵێکی زۆر گرنگ

**خاڵی یەکەم:** کێشەی حوکمی مەولوود ئایا دروستە یان دروست نییە، کێشەیەکی قەتعیی (قطعي) یەکلاکراوە نییە، لەبەر ئەوە ناتوانیت بە شێوەکیی قەتعیی و ڕەها (قطعي ومطلق) بڵێیت: (١٠٠ %) دروستە، یاخود بەشێوەکی قەتعیی و ڕەها بڵێیت: (١٠٠ %) دروست نییە، چونکە لە لایەکەوە بەڵگەیەکی تایبەت بە مەولوود -نە لەسەر دروستبوونی و، نە لەسەر دروست نەبوونی- نەهاتووە، بەڵکو گشت بەڵگەکانی دروست بوون و نا دروست بوونی مەولوود گشتیین یاخود قیاس و ئیجتیهادن.

لە لایەکی دیکەوە گریمان بڵێین بەڵگەی تایبەتی لە سەرە؛ بەڵام مەرج نییە ئەو بەڵگە تایبەتە لەڕووی چەسپاویی و دەلالەتەوە قەتعیی بێت واتە (قطعي الدلالة والثبوت) بێت، هەروەها ئەگەر بەڵگەکانی دروستی و نادروستی قەتعییش بن مەرج نییە ئەوەی لای تۆ قەتعیی بێت لای کەسێکی دیکە بە هەمان شێوە قەتعیی بێت.

گوێ لە ( ابن تيمية –رحمه الله ) بگرن چۆن باسی (القطعي والظني) قەتعیی و زەننییمان بۆ دەکات و دەفەرموویت:

(أَمَّا كَوْنُهُ عندَ الْمُسْتَمِعِ مَعْلُومًا أَوْ مَظْنُونًا أَوْ مَجْهُولًا أَوْ قَطْعِيًا أَوْ ظَنِّيًّا أَوْ يَجِبُ قَبُولُهُ أَوْ يَحْرُمُ أَوْ يَكْفُرُ جَاحِدُهُ أَوْ لَا يَكْفُرُ؛ فَهَذِهِ أَحْكَامٌ عَمَلِيَّةٌ تَخْتَلِفُ بِاخْتِلَافِ الأَشْخَاصِ وَالأَحْوَالِ)[1]

---

(١) مجموع الفتاوى، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني (المتوفى: ٧٢٨هـ)، المحقق: عبد الرحمن بن محمد بن قاسم، نشر مجمع الملك فهد لطباعة

دەڵێت: بابەتێک کە بە لای تۆوە قەتعییە یان زەنییە، یان زانراوە یان نەزانراوە، یان واجبە وەربگریت، یان حەرامە، یان بە وەرنەگرتنی کافر دەبیت یان کافر نابیت؛ ئەمانە ئەحکامی کردارین و، لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە و، لە بارودۆخێکە و بۆ بارودۆخێکی دیکە دەگۆڕێن.

لە جێگایەکی دیکەدا دەڵێت: هەرکەسێک کۆشش بکات بۆ گەیشتن بە هەق و هەڵە بکات و هەق نەپێکێت بەهیچ شێوەیەک لای خودا تاوانبار نابێت با هەڵەکەشی لە بابەتگەلی تیۆریی یان پراکتیکیدا بێت و، دەفەرمووێت: (فَمَنْ كَانَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ مُجْتَهِدًا فِي طَلَبِ الْحَقِّ وَأَخْطَأَ فَإِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ لَهُ خَطَأَهُ كَائِنًا مَا كَانَ سَوَاءٌ كَانَ فِي الْمَسَائِلِ النَّظَرِيَّةِ أَوْ الْعَمَلِيَّةِ، هَذَا الَّذِي عَلَيْهِ أَصْحَابُ النَّبِيِّ -صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- وَجَمَاهِيرُ أَئِمَّةِ الْإِسْلَامِ) (١)

واتە: هەر کەسێک بڕوادار بێت و بەشوێن هەقدا بگەڕێت بەڵام هەق نەدۆزێتەوە (فَإِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ لَهُ خَطَأَهُ) ئەوە پەروەردگار لە هەڵەکەی خۆش دەبێت، جا هەر هەڵەیەک بێت، هەڵەکەی لە بابەتە تیۆرییەکان یان بابەتە پراکتیکیەکان بێت، ئەمە ڕای هاوەڵانی پێغەمبەر -دروودی خودای لە سەر بێت- و جەماوەری پێشەوایانی ئیسلامە.

---

المصحف الشريف، المدينة النبوية، المملكة العربية السعودية،عام النشر: ١٤١٦هـ/١٩٩٥م:٦١/٦

(١) مجموع الفتاوى: ٢٣/ ٣٤٦.

لە جێگـایەکی دیـکەدا دەڵێـت: ئەوەی بڵێـت: هەر کەس -لە بـابەتێکی قەتعیی بێـت یـان زەننیی- هەڵە لە ئیجتیهـادکردن بکـات گونامبـارە، ئەوە پێچەوانەی قورئان و سـوونەت و کۆدەنگیی زانایانی کۆنی کردووە.[1]

بـۆیە دەڵێـین: بـابەتی حـوکمی مەولـوود دروسـت بێـت یـان نـا بـابەتێکی قەتعیی یەکلاکراوەیی نییە، هەروەها بابەتێکی فیقهیی فەرعیە و، پەیوەنـدیی بە عەقیدە و بیروباوەڕەوە نییە.

ئـێمە لێرەدا باسـی مەولوودێـک دەکەیـن گونـاه و شـیرک و سـەرپێچیی فەرمانەکانی خـودا و پێغەمبەری تێدا نەبێت –دروودی خودای لە سـەر بێت- وەک تێکەڵیی ژن و پیـاو و فڕێـدانی حیجـاب و سـوژدە بـردن و هـاوارکردنە غەیـری خـودا و فیکەلێـدان و خۆبـادان و ڕەقـس و سـەما، هەروەهـا بە هـیچ

---

(١) (فَمَنْ قَالَ: إنَّ الْمُخْطِئَ فِي مَسْأَلَةٍ قَطْعِيَّةٍ أَوْ ظَنِّيَّةٍ يَأْثَمُ، فَقَدْ خَالَفَ الْكِتَابَ وَالسُّنَّةَ وَالْإِجْمَاعَ الْقَدِيمَ. قَالُوا: وَأَيْضًا فَكَوْنُ الْمَسْأَلَةِ قَطْعِيَّةً أَوْ ظَنِّيَّةً هُوَ أَمْرٌ إضَافِيٌّ بِحَسَبِ حَالِ الْمُعْتَقِدِينَ. لَيْسَ هُوَ وَصْفًا لِلْقَوْلِ فِي نَفْسِهِ ; فَإِنَّ الْإِنْسَانَ قَدْ يَقْطَعُ بِأَشْيَاءَ عَلِمَهَا بِالضَّرُورَةِ أَوْ بِالنَّقْلِ الْمَعْلُومِ صِدْقُهُ عِنْدَهُ، وَغَيْرُهُ لَا يَعْرِفُ ذَلِكَ لَا قَطْعًا وَلَا ظَنًّا، وَقَدْ يَكُونُ الْإِنْسَانُ ذَكِيًّا قَوِيَّ الذِّهْنِ سَرِيعَ الْإِدْرَاكِ عِلْمًا وَظَنًّا فَيَعْرِفُ مِنَ الْحَقِّ وَيَقْطَعُ بِهِ مَا لَا يَتَصَوَّرُهُ غَيْرُهُ وَلَا يَعْرِفُهُ لَا عِلْمًا وَلَا ظَنًّا؛ فَالْقَطْعُ وَالظَّنُّ يَكُونُ بِحَسَبِ مَا وَصَلَ إلَى الْإِنْسَانِ مِنَ الْأَدِلَّةِ، وَبِحَسَبِ قُدْرَتِهِ عَلَى الِاسْتِدْلَالِ.

وَالنَّاسُ يَخْتَلِفُونَ فِي هَذَا وَهَذَا، فَكَوْنُ الْمَسْأَلَةِ قَطْعِيَّةً أَوْ ظَنِّيَّةً لَيْسَ هُوَ صِفَةً مُلَازِمَةً لِلْقَوْلِ الْمُتَنَازَعِ فِيهِ، حَتَّى يُقَالَ: كُلُّ مَنْ خَالَفَهُ قَدْ خَالَفَ الْقَطْعِيَّ، بَلْ هُوَ صِفَةٌ لِحَالِ النَّاظِرِ الْمُسْتَدِلِّ الْمُعْتَقِدِ، وَهَذَا مِمَّا يَخْتَلِفُ فِيهِ النَّاسُ. فَعُلِمَ أَنَّ هَذَا الْفَرْقَ لَا يَطَّرِدُ وَلَا يَنْعَكِسُ.)

مجموع الفتاوى لابن تيمية: ١٩/ ٢١٠-٢١١ منهاج السنة النبوية في نقض كلام الشيعة القدرية، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني (المتوفى: ٧٢٨هـ)، المحقق: محمد رشاد سالم، جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية، الطبعة: الأولى، ١٤٠٦ هـ - ١٩٨٦ م: : ٩١/٥

شێوەیەک وشەیەکی ناشەرعیی تێدا بەکارنەهێنرێت و، وەسفێکی پێغەمبەری تێدا نەکرێت بیگەیەنێتە ئاستی خودا یان نزیکی خودا -نعوذ بالله-، چونکە هەندێک لەو گوناهانە دەچنە بابەتی عەقیدەوە، بەڵام ئێمە باسی مەولوودێک دەکەین دوور بێت لە گوناه و شیرک و کوفر و گومڕایی.

هەروەها هەندێک دەنگخۆش و مەولوودخوێن وەرزی مەولوودیان کردووەتە وەرزی بازرگانیکردن بە پێغەمبەر –درووودی خودای لە سەر بێت- و پارە وەرگرتن و گیرفان پڕکردن، بە زار دەڵێن: قوربانتم رسول الله، بەڵام بە زمانی دڵ و حاڵ هاوار دەکەن قوربانم بیت رسول الله .!!!

بەڵام ئەگەر مەولوودێک گوناه و ناشەرعیی تێدا بوو ئەوە تەنها ئەو مەولوودە حەرام دەبێت، نەک گشت مەولوودێک کە حەرام و ناشەرعیشی تێدا نەبێت، کێشەی هەندێک لە نەیارانی مەولوود ئەوەیە لەبەر بوونی ناشەرعیی لە هەندێک مەراسیمی مەولوودی هەندێک کەس و لایەندا حوکمی گشتیی بەسەر مەولووددا دەدەن و، گشت مەولوودێک حەرام دەکەن.

لە کاتێکدا هەموو بۆنەیەکی ئایینی، بەڵکو جەژنی قوربان و جەژنی ڕەمەزانیش ئەگەر بە گوناهکردن بەڕێوەیان ببەیت تەنها ئەو جەژنە حەرام دەبێت و، ناتوانیت بڵێیت مادام جەژنی قوربان لە جێگایەکدا و لای چەند کەسانێک بە ناشەرعیی ئەنجام دەدرێت ئیتر نابێت جەژن لە هیچ جێگایەکدا بکرێت، بەڵکو دەبێت بڵێیت: پێویستە ئەو ناشەرعیانە لەو جەژنەدا بنبڕ بکرێن و، هەوڵ بۆ بنبڕکردنی ناشەرعیەکانی ئەو بۆنە ئایینییانە بدەیت، نەک خودی جەژنەکە لە گشت کەس و گشت جێگا و گشت ساتێکدا حەرام بکەیت.

**خـاڵی دووەم:** بە هـیچ شـێوەیەک دروسـت نیـیە لە بـابەتی حـوکمی مەولـوودا خـۆت نزیـک بکەیتەوە لە گومڕاکردنی بەرامبەر کە ڕای جیـاوازی هەیە، وەک هەنـدێک بەنـاو بـانگخواز دەیکەن، ئەگەر پرسـیار بکەی بۆ؟ لە وەڵامدا دەڵێم:

لە بەر ئەوەی کاتێـک بـۆ یەکەم جـار یـادی مەولـوود کـرا زانایـان کۆدەنگبوون لە سـەر ئەوەی کە دروستە، بەڵام ئەو کۆدەنگیە نابێتە بەڵگە و حـوججەتی قەتعیی یەکـلاکەرەوە، چـونکە کـۆدەنگیەکی سـکوتیە (اجمـاع سـکوتی) ئیجمـاعی سـکوتیش ئەگەر حـوججەش بێـت حـوججەیەکی زەننـیە (حجة ظنية).

بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا دەڵێـین زۆربەی زۆری ئەو زانایـانەی باسـی مەولوودیـان کـردووە و مەواڵ و خەبەرنامـان پێگەشـتبێت فەرموویـانە یـادکردنەوەی مەولـوودی خۆشەویسـت -درووودی خـودای لە سـەر بێـت- دروسـتە، وەک (الحـافظ ابـن حجـر العسـقلاني – الحـافظ السـيوطي – الحـافظ السـخاوي – الحـافظ العراقي و متـد ) بەڵکـو کتێبشـیان لە سـەر دانـاوە و، هـیچ کێشـە و گرفتێکیـان لە دروسـتیی مەولـوودا نەبـووە و، بە دەگـمەن زانـایەکی پێشـین و سـەردەمی کـۆن دەبینیـتەوە کە یـادکردنەوەی مەولوودی لا ڕەوا نەبێت.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا زانـایەکی نـاودار و بەرزی وەک (الإمـام الشـاطبي) دەفەرمووێت: مەولوود بیدعەیە.[1]

---

(١) الاعتصـام، إبـراهيم بـن موسـى بـن محمد اللخمـي الغرنـاطي الشـهير بالشـاطبي (المتـوفى: ٧٩٠هـ)، تحقيق: سليم بن عيد الهلالي، الناشر: دار ابن عفان، السعودية، الطبعة: الأولى، ١٤١٢هـ - ١٩٩٢م: ١/ ٥٣.

کاتێک جەنابت حوکمی مەولوود بە بابەتێکی قەتعیی دەزانیت؛ دەبێت بزانیت نکووڵی کردن لە قەتعیی کوفرە و، مونکیری قەتعیی کافرە! جا ئەگەر مەولوود بەلاتەوە بە قەتعیی دروست نییە و بیدعە و گومڕاییە ئایا دەوێریت و جورئەت دەکەیت ئەو زانایانەی فەرموویانە یادی مەولوود دروستە گومڕا یان کافر بکەیت.!!

دەوێریت بە (الحافظ ابن حجر العسقلانی ) کە شارحی بوخاریە و خاوەنی (فتح الباري)یە بڵێیت: کافرە؟ جورئەت دەکەیت بە: ( الحافظ السخاوی و الحافظ السیوطي والحافظ العراقي) سەدان زانای پایەداری وەک ئەوان بڵێیت: کافرن یا گومڕان؟ ئەگەر دەوێریت و جورئەت دەکەیت گومڕا یان کافریان بکەیت، ئەوە بابەتێکی دیکەیە و، ناتوانین بە یەک بگەین و، نیدی زمانی دیالۆگ گرێدەدەین و، دەبێت خۆت بۆ پرس و سزای ڕۆژی قیامەت ئامادەبکەیت.

لە بەرامبەریشدا گەر بەلای جەنابیشتەوە مەولوود (١٠٠%) دروستە و بابەتێکی قەتعیی و یەکلاکراوەیە، ئایا جورئەت دەکەیت کەسانێکی وەک (الإمام الشاطبي والفاكهاني) کە بەلایانەوە یادی مەولوود بیدعەیە؛ کافر یان گومڕا بکەیت.!!

باوەڕ ناکەم کەستان جورئەتی کافرکردن و گومڕاکردنتان هەبێت.!

بەڵام بە داخەوە لەگەڵ ئەوەشدا گوێم لە مامۆستایەک بووە زۆر بە ئاسایی و بوێرییەوە دەیگوت: ئەوەی بڵێت یادی مەولوود دروستە ئەوە بیدعەچیە و گومڕایە!! زۆر بە ئاسانیی ئەو زانا گەورانەی مەولوودیان بەلاوە دروستە بە گومڕابوو و بیدعەچی ناوزەد دەکرد.!

بەڵکو توندڕەویی و دەمارگیریی وای لە زانایەکی وەک (محمد حامد الفقی) دەکات مەولوود بە عیبادەت بۆ غەیری خودا بداتە قەڵەم و، دەڵێت:

"والمواليد والذكريات التي ملأت البلاد باسم الأولياء هي نوع من العبادة لهم وتعظيمهم"(١)

واتە: یادەوەریی لەدایکبوون و بۆنەکان کە بەناوی ئەولیاکانەوە دەکرێن جۆرێکە لە عیبادەت کردن بۆیان و گەورەکردنیان.!!

ئەم قسەیە ئەوە دەگەیەنێت کاتێک یادی مەولوودی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکەیت ئەوە عیبادەتت بۆ پێغەمبەر کردووە نەک بۆ خودا، بەم شێوەیە و زۆر بە ئاسانی حوکمی شیرکیان دەداتە پاڵ.!!

بەم کارەشی دەکەوێتە داوی چەند هەڵەیەکی زەق و ترسناک، هەڵەی بە قەتعیی کردنی زەننی، هەڵەی بە عەقیدەکردنی بابەتی فیقهیی، هەڵەی وێرانی موشریککردنی زۆربە و هەرە زۆری زانایانی ئوممەتی ئیسلام.

**حاڵی سێیەم:** دەبێت لە حوکمی مەولووددا گومانی باشمان بەرامبەر خاوەن ڕای جیا هەبێت، بۆیە کاتێک ئەو زانا بەڕێزانەی دەفەرموون: مەولوود دروستە؛ نابێت گومانی خراپیان پێببەین و، پێیان بڵێین: ئەو زانایانە دوژمنایەتی سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکەن، بەڵکو دەبێت بڵێین: خۆشەویستیی پێغەمبەر –درودی خودای لە سەر بێت- هانی داون و، وای لێکردوون ئەو یادە زیندووبکەنەوە.

---

(١) فتح المجيد شرح كتاب التوحيد، عبد الرحمن بن حسن بن محمد بن عبد الوهاب بن سليمان التميمي (المتوفى: ١٢٨٥هـ)، المحقق: محمد حامد الفقي، مطبعة السنة المحمدية، القاهرة، مصر، الطبعة: السابعة، ١٣٧٧هـ/١٩٥٧م: ١٥٤.

هەروەها دەبێت بە هەمان شێوە گومانی باش بەو زانایانە ببەین کە فەرموویانە: یادی مەولوود دروست نییە و بیدعەیە و، دەبێت بڵێین: خۆشەویستی شوێنکەوتنی خۆشەویست -دروودی خودای لەسەر بێت- هانیداون بفەرموون دروست نییە و بیدعەیە.

بۆیە بە هیچ شێوەیەک نابێت ئەم سنوورە ببەزێنین، وەک ئەوەی ئێستا لە هەندێک مامۆستا و بانگخوازدا دەیبینین و دەیبیستین چۆن بە شێوازێکی ناشیرین و زمانێکی زبر یەکتر تۆمەتبار دەکەن بە گومڕایی و ڕقبوون لە پێغەمبەر یاخود دەرچوون و لادان لە سوننەتی پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت-.

مامۆستایەک دەڵێت: زینا بکەیت یان عارەق بخۆیتەوە گوناهی کەمترە لە بەشداربکردن لە یادی مەولوود، هەروەها گۆشتی بەراز بخۆیت گوناهی کەمترە لە خواردنی چکلێتی مەولوودێک.!!

**خاڵی چوارەم:** ئەرکی سەرشانی هەریەکە لەو کەسانەی دەڵێن: مەولوود دروستە و، ئەو کەسانەشی دەڵێن: دروست نییە؛ ئەوەیە ئەدەب بنوێنن لە خزمەتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم).

بۆیە جاری وا هەبووە هەواڵی هاوەڵی خۆشەویستمان خوێندووەتەوە بە ڕواڵەت لە فەرمانی پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- لایداوە و موخالەفەی کردووە، بەڵام کەس تۆمەتباری نەکردووە بەوەی ڕقی لە پێغەمبەرە-دروودی خودای لەسەر بێت- یاخود لە سوننەتی پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- لایداوە، یاخود بێ ئەدەبی کردووە لە خزمەتی خۆشەویستدا -دروودی خودای لەسەر بێت-، نەخێر، بەڵکو خودی پێغەمبەریش -دروودی خودای لەسەر بێت- ئەو لادان و موخالەفەی

پەسەند کردووە و، خۆی لێ تووڕە نەکردووە و، خاوەنەکەی بە بێ ئەدەب نەداوەتە قەڵەم، چونکە زانیویانە ئەو لادان و موخالەفەیە لەبەر ئەوە نەبووە ڕقی لە پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- بووبێت، یان مەبەستی بێ ئەدەبی کردن بووبێت لە خزمەتی پێغەمبەردا -دروودی خودای لەسەر بێت-، بەڵکو ئەدەبنواندن لە خزمەتی کەسێکی گەورەی وەک پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- وای لێکردووە بە ڕواڵەت لە فەرمانی پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- لا بدات.

لێرەدا دوو نموونەی جوانتان بۆ دەهێنینەوە کە هەردووکیان لە فەرموودەی ڕاست و دروستدا هاتوون:

**نموونەی یەکەم:** ڕۆژێکیان پێغەمبەری نازدارمان -دروودی خودای لەسەر بێت- بۆ کارێکی خێر و سوڵح و ئاشتیی دەچێتە لای هۆزی (بنی عمرو بن عوف)، ئیمامی ئەبوبەکر -ڕەزای خودای لێبێت- لە مزگەوت دەبێت، بانگوێژەکە دێتە لای ئەبوبەکر و، دەڵێت: قامەت بکەم نوێژەکەمان بۆ بکەیت؟! ئەویش فەرمووی: بەڵێ، لە نوێژدا دەبن پێغەمبەری نازدارمان -دروودی خودای لەسەر بێت- دەگەڕێتەوە، کاتێک ئەبوبەکر پێی دەزانێت دەیەوێت بگەڕێتەوە دواوە، پێغەمبەری نازدارمان فەرمانی پێدەکات کە لە جێگەی خۆیدا بمێنێتەوە و ئیمامەتەکە تەواوبکات و دەفەرمووێت: (امکث مکانك) واتە: لە جێی خۆت بمێنەوە، بەڵام ئیمامی ئەبوبەکر لە جێی خۆی نامێنێتەوە و دەگەڕێتە دواوە، پێغەمبەری نازدارمان -دروودی خودای لەسەر بێت- پێش دەکەوێت و نوێژەکەیان بۆ تەواو دەکات، پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- دوای تەواو بوونی نوێژ پرسیاری لێ دەکات و دەفەرمووێت: (ئەی ئەبوبەکر، من فەرمانم پێ کردیت لە جێی خۆتدا

بمێنیتەوە، بۆ گەڕایتەوە دواوە؟) ئەبوبەکریش دەفەرمووێت: (مَا كَانَ لِابْنِ أبي قُحَافَةَ أن يصلي بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللهِ صلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) واتە: کوڕی ئەبوقوحافە بۆی نیيە پێشی پێغەمبەر -درودی خودای لەسەر بێت- بکەوێت و ئیمامەتی بۆ بکات.(١)

---

(١) عن سهل بن سعد الساعدي : أن رسول الله صلى الله عليه وسلم ذهب إلى بني عمرو بن عوف ليصلح بينهم ، فحانت الصلاة ، فجاء المؤذن إلى أبي بكر ، فقال : أتصلي للناس فأقيم ؟ قال : نعم فصلى أبو بكر ، فجاء رسول الله صلى الله عليه وسلم والناس في الصلاة ، فتخلص حتى وقف في الصف ، فصفق الناس وكان أبو بكر لا يلتفت في صلاته ، فلما أكثر الناس التصفيق التفت ، فرأى رسول الله صلى الله عليه وسلم ، فأشار إليه رسول الله صلى الله عليه وسلم : " أن امكث مكانك " ، فرفع أبو بكر رضي الله عنه يديه ، فحمد الله على ما أمره به رسول الله صلى الله عليه وسلم من ذلك ، ثم استأخر أبو بكر حتى استوى في الصف ، وتقدم رسول الله صلى الله عليه وسلم ، فصلى ، فلما انصرف قال : " يا أبا بكر ما منعك أن تثبت إذ أمرتك " فقال أبو بكر : ما كان لابن أبي قحافة أن يصلي بين يدي رسول الله صلى الله عليه وسلم ، فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم : " ما لي رأيتكم أكثرتم التصفيق ، من رابه شيء في صلاته ، فليسبح فإنه إذا سبح التفت إليه ، وإنما التصفيق للنساء " الجامع المسند الصحيح المختصر من أمور رسول الله صلى الله عليه وسلم وسننه وأيامه = صحيح البخاري، محمد بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري، المحقق: محمد زهير بن ناصر الناصر، دار طوق النجاة، ترقيم ترقيم محمد فؤاد عبد الباقي) الطبعة: الأولى، ١٤٢٢هـ- كتاب الأذان- أبواب صلاة الجماعة والإمامة- باب من دخل ليؤم الناس برقم:٦٤٨: ج:١/١٣٧، وصحيح مسلم، مسلم بن الحجاج أبو الحسن القشيري النيسابوري (المتوفى: ٢٦١هـ) المحقق: محمد فؤاد عبد الباقي، دار إحياء التراث العربي – بيروت، كتاب الصلاة- باب تقديم الجماعة من يصلي بهم إذا تأخر الإمام ولم يخافوا:١/٣١٦

**نمــوونەی دووەم: لە پەیمـانی حــودەیبیەدا (صـلح الحدیبیـة) کاتێـک** ســومەیلی کـوڕی عەمـر لەگەڵ پێغەمـبەری نازدارمـان –دروودی خــودای لەسەر بێت- ڕێک دەکەون و پەیمانی ئاشتیی دەبەستن، پێغەمبەر –دروودی خودای لەسەر بێت- فەرمان بە ئیمامی عەلی دەدات –خودا لێی ڕازیی بێت- کە ڕێککەوتننامەکە بنووسێت، ئەویش دەست بە نووسین دەکات، پێغەمبەر –دروودی خودای لەسەر بێت- بە ئیمامی عەلی دەفەرمووێت: بنووسە ئەمە ڕێککەوتننـامەی مـوحەممەد پێغەمـبەری خـودایە –دروودی خـودای لەسـەر بێت- لەگەڵ سومەیلی کوڕی عەمرا، سومەیلی کوری عەمر ڕەخنە دەگرێت و دەڵێت: گەر پێغەمبەری خـودا بوویتایە لەگەڵتدا نەدەجەنگاین! بۆیە نابێت بنووسیت (رسول الله)، پێغەمبەر –دروودی خودای لەسەر بێت- فەرمان بە عەلی دەدات و دەفەرمووێت: بـڕگەی (رسـول الله) بکوژێنێتەوە، بەڵام ئیمامی عەلی دەڵێـت: من نـایکوژێنمەوە، بـۆیە خـودی پێغەمبەر دەیکوژێنێتەوە بەبێ ئەوەی لۆمەی ئیمامی عەلی بکات.(١)

---

(١) عن أبي إسحاق ، قال : سمعت البراء بن عازب رضي الله عنهما ، قال : لما صالح رسول الله صلى الله عليه وسلم أهل الحديبية ، كتب علي بن أبي طالب بينهم كتابا ، فكتب: محمد رسول الله ، فقال المشركون : لا تكتب محمد رسول الله ، لو كنت رسولا لم نقاتلك ، فقال لعلي : " امحه " ، فقال علي : ما أنا بالذي أمحاه ، فمحاه رسول الله صلى الله عليه وسلم بيده ، وصالحهم على أن يدخل هو وأصحابه ثلاثة أيام ، ولا يدخلوها إلا بجلبان السلاح ، فسألوه ما جلبان السلاح ؟ فقال : القراب بما فيه .

صحيح البخاري - كتاب الصلح- باب : كيف يكتب هذا : ما صالح فلان بن فلان برقم ٢٦٩٨:ج٣/ص١٨٤، وصحيح مسلم - كتاب الجهاد والسير- باب صلح الحديبية في الحديبية -:ج٣/ص١٤٠٩.

پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- لەم دوو نموونەدا بە هیچ شێوەیەک زویر نابێت و نە لە ئیمامی ئەبوبەکر و نە لە ئیمامی عەلی دڵی ناڕەنجێت، چونکە دەزانێت مەبەستی هەردوو پێشەوا ئەبوبەکر و عەلی ئەدەبنواندن بووە لە خزمەت خۆشەویستدا -دروودی خودای لەسەر بێت- نەک مەبەستیان -خودا نەخواستە- بێ ئەدەبیکردن بێت لە خزمەت مەقامی بەرز و پیرۆزی خۆشەویستدا -دروودی خودای لەسەر بێت-.

خۆ ئەگەر -خودا نەخواستە- مەبەستیان سەرپێچیکردنی فەرمانی پێغەمبەر بوایە ئەوا سزا و سەرزەنشتی خۆیان وەردەگرت.

بۆیە زانایان فەرموویانە مەبەست لەم سەرپێچییە ئەدەبنواندن بووە لە خزمەت خۆشەویستدا -دروودی خودای لەسەر بێت- نەک بێ ئەدەبیکردن.[1]

ئیمامی (شەوکانی) لە باسی زیادکردنی وشەی (سیدنا) لە پێش ناوی خۆشەویست -درودی خودای لەسەر بێت- دەفەرمووێت: بەلای (عز الدين بن عبد السلام)ەوە زیادکردنی وشەی (سیدنا) پێش ناوی خۆشەویست ڕەچاوکردنی ئەدەبە.

(وَقَدْ رُوِيَ عَنْ ابْنِ عَبْدِ السَّلَامِ أَنَّهُ جَعَلَهُ مِنْ بَابِ سُلُوكِ الْأَدَبِ، وَهُوَ مَبْنِيٌّ عَلَى أَنَّ سُلُوكَ طَرِيقِ الْأَدَبِ أَحَبُّ مِنْ الِامْتِثَالِ)[1]

---

(١) قَالَ الْعُلَمَاءُ وَهَذَا الَّذِي فَعَلَهُ عَلِيٌّ مِنْ بَابِ الْأَدَبِ الْمُسْتَحَبِّ ; لِأَنَّهُ لَمْ يَفْهَمْ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَحْتِيمَ مَحْوِ عَلَى نَفْسِهِ، وَلِهَذَا لَمْ يُنْكِرْهُ عَلَيْهِ، وَلَوْ حَتَّمَ مَحْوَهُ بِنَفْسِهِ لَمْ يَجُزْ لِعَلِيٍّ تَرْكُهُ اهـ مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح، المؤلف: علي بن (سلطان) محمد، أبو الحسن نور الدين الملا الهروي القاري (المتوفى: ١٠١٤هـ)، الناشر: دار الفكر، بيروت – لبنان، الطبعة: الأولى، ١٤٢٢هـ - ٢٠٠٢م: ٦/٢٦١٥

ئیمامی عەلی –ڕەزای خودای لێ بێت- جورئەتی ئەوەی نەکردووە وشەی (رسول الله) لە ناوی پێغەمبەر بسڕێتەوە، پێغەمبەری نازداریشمان (دروودی خودای لەسەر بێت) تووڕە نابێت و، بە دەستی موبارەکی خۆی دەیسڕێتەوە، کەواتە زۆر زۆر گرنگە هەر ڕایەک هەڵدەبژێریت بێ ئەدەبی لە بەرامبەر پێغەمبەردا –دروودی خودای لە سەر بێت- نەکەیت، ئاگاداری مەقامی بەرزی ئەو خۆشەویستە بیت و خۆت فیدای بەرنامەکەی بکەیت.

با پێکەوە بچینە خزمەتی زانای خواناس (ابن القیم) چۆن لە پەرتووکی (بدائع الفوائد)دا ئەم فەرمایشتە شیرینەمان لە زاری زانای ناوداری مەزهەبی ئیمام ئەحمەد (ابن عقیل الحنبلی)یەوە بۆ دەگێڕێتەوە -کە خاوەنی چەند کتێبێکە، یەکێک لە کتێبەکانی بە ناوی (الفنون) هەشت سەد بەرگە- ، ئیمامی (ابن القیم) دەفەرمووێت:

کەسێک پرسیار لە (ابن عقیل) دەکات: ئایا کەعبە پیرۆزترە یان حوجرەی شەریف کە پێغەمبەری تێدایە (علیه الصلاة والسلام) ، (ابن عقیل الحنبلی) لە وەڵامدا دەفەرمووێت: (إن أردت مجرد الحجرة فالكعبة أفضل) ئەگەر مەبەستت تەنها دار و دیوار و بەردی حوجرەکەیە، ئەوە کەعبە پیرۆزترە، (وإن أردت وهو فيها فلا والله ولا العرش وحملته ولا جنة عدن ولا الأفلاك الدائرة، لأن بالحجرة جسداً لو وزن بالكونين لرجح)، ئەگەر مەبەستیشت حوجرەکەیە بە پێغەمبەرەوە – دروودی

(١) نيل الأوطار، محمد بن علي بن محمد بن عبد الله الشوكاني اليمني (المتوفى: ١٢٥٠هـ)، تحقيق: عصام الدين الصبابطي، دار الحديث، مصر، الطبعة: الأولى، ١٤١٣هـ-١٩٩٣م:٢/٣٣٨

خــودای لەســەر بێــت- نە بەخــودا، نە کەعــبە، نە عەرش، نە فریشــتەی مەڵگرانی عەرش، نە بەهەشتی عەدن، نە هەموو گەردوون ناگەنە ئاست و پلەو پایەی ئەو لاشــە پیرۆزەی کە لە نـاو حـوجرەکەدایە، چـونکە لەشـێکی تێـدایە ئەگەر بخـرێتە تـای تەرازوویەک و هەمـوو گەردوون بخـرێتە تـاکەی تـریەوە، تـای تەرازووی ئەو لەشــە پیرۆزە قورســترە، زانایـان ئـا بەو شـێوە پێغەمبەریان خۆشویستووە –ڕۆحمان بە فیدای خۆی و بەرنامەکەی بێت- .

**خاڵی پێنجەم:** دەبێت دیالۆگ و موجادەلەمان بە چاکترین شێواز و، دوور لە گـاڵتە و ســووکایەتی پێکــردن و نــاو و ناتۆرەلێنــان و، نــاوزڕان و تۆمەتبارکردنی یەکتر بێت، چونکە خودای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ﴾ النحل: ١٢٥

تۆ بە حیکمەت و ئامۆژگاریی جوان بانگەشەی حەق بکە.

جیــاوازییەک هەیە لە نێــوان مەوعیــزە و موجــادەلە، مەوعیــزە و ئامۆژگاریکردن بـۆ کەسـانێکە گوێـت لێبگـرن و متمـانەت پێـبکەن، مەرجی مەوعیزە و ئامۆژگاریی ئەوەیە بە وشــەی بـاش و شـێوازێکی بـاش (حەســەن) بێـت، بەڵام موجـادەلە لە کاتێکـدا دەبێـت بـاوەڕ بە قسـەی یەکـدی نەکەن و ڕای جیاوازتـان هەبێـت، بـۆیە هەرکاتێـک ئاسـتی ئامۆژگـاریی دەگـاتە ئاسـتی موجادەلە و باوەڕنەکردن بە قسەی یەکتر، ئیدی مەرجی حەسەن نامێنێت و حەرام دەبێت، چـونکە لە حەسـەنەوە دەبێـتە ئەحسـەن، واتە نەک بە وشـەی باش و شێوازی باش دیالۆگ بکەن، بەڵکو دەبێت بە باشترین وشە و باشترین شێوە دیالۆگ بکەین، بۆیە دەفەرمووێـت: ﴿وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ﴾ واتە بە باشـترین وشــە و باشـترین شـێوە موجادەلەیـان لەگەڵـدا بـکە، ئینجـا وەرە

لەلایەکەوە سەیری ئەم دەقە پیرۆزانە و لەلایەکی دیکەوە سەرنجی دیالۆگی موسوڵمانان بکە و مەناسەی غەم و خەفەت مەڵمژە و، بزانە چۆن دیالۆگیان نە حەسەنە و نە ئەحسەنە، بەڵکو خراپ و خراپترین و نەسوەئە.

**خاڵی شەشەم:** ئەرکی سەرشانی گشت بڕوادارێکە بە لەدایکبوونی پێغەمبەری نازدارمان (درودی خودای لەسەر بێت) دڵخۆش بێت، باوەڕناکەم موسوڵمانێک مەبێت خۆی بە موسوڵمان بزانێت و، بە لەدایکبوونی پێغەمبەری نازدارمان (درودی خودای لەسەر بێت) دڵخۆش نەبێت.!

چۆن بە لەدایکبوونی زاتێک دڵخۆش نابیت کە خودای گەورە کردوویەتی بە منەت بەسەر بڕوادارانەوە و، لە سوورەی ئالی عیمراندا دەفەرمووێت:

﴿ لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾ ﴾ آل عمران: ١٦٤

خودا چاکییەکی زۆر گەورەی لەگەڵ موسوڵماناندا کرد کە لە خۆیان پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە کردوون ئایەتەکانی قورئانیان بۆ دەخوێنێتەوە و، لە گوناه و کاری زشت پاکیان دەکاتەوە و، قورئان و حیکمەتیان فێر دەکات، ئەگەر چی لەوەو پێش لە گومڕایی و جەهالەتدا بوون.

هەندێک دەڵێن: نا، مامۆستا، ئەم ئایەتە باسی بیعسەت و ناردنی پێغەمبەر دەکات (درودی خودای لەسەر بێت)، نەک لەدایکبوونی، ئێمەش دەڵێین: بەڵێ، ئەگەر ویلادەت و لەدایکبوون نەبێت بیعسەت و ناردن و پێغەمبەرایەتی نابێت، نازانم جەنابت مەبەستت ئەوەیە بە لەدایکبوونی

گەورەی جیهـان و حەبیبی ڕەحمـان دڵخـۆش نەبـین، گەر بە لەدایکبـوونی دڵخـۆش نەبـین، دەبێـت بە لە دایکبـوونی خۆشەویسـت و نـووری دیـدە و سەروەر و سەردارمان دڵتەنگ و غەمبار بین.!!

**خاڵی حەوتەم:** یادەوەری و زیندووکردنەوەی ئەو یادە پیرۆزە جەژنێکی ئـایینی وەک هەردوو جەژنی قوربـان و جەژنی ڕەمەزان نیـیە تـاوەکو بڵێیـت: جەژن دوو جەژنە و نابێت بکرێتە سێ جەژن، بەڵکو بۆنەیەکی پیرۆزی ئایینیە و موسوڵمانان تێیدا دڵخۆشیی خۆیان وەک وەفایەک بۆ ئەو سەروەر و تاجی سەرە دەردەبڕن.

**خاڵی هەشتەم:** مەر کەسێک بڵێت: مەولـوود دروسـتە، یان دروسـت نییە، نابێت بێت بە خەیاڵیدا ئەم کارە ئەوە دەگەیەنێت دین کامڵ نەبـووە و بە مەولـوود کـردن کامڵ دەبێت و، ئەمەش پێچەوانەی ئـایەتی: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا﴾ المائـدة:٣ ، بـۆیە ئەگەر وا بیر بکەیتەوە کە دین بە مەولوودکردن کامڵ دەبێت، ئەوا لە دین دەردەچیت، یاخود وا بێت بەخەیاڵتدا کە ئەوانەی مەولوودیـان بەلاوە دروسـتە وادەزانن دیـن بە مەولـوود کامـڵ دەبێـت ئەوە تـۆمەتێکی گەورە و نـامەقیەکی زۆر بەرامبەریان دەکەیت و حوکمی بەکافرکردنیان دەدەیت.!!

**خاڵی نۆیەم:** دەبێت کۆ دەنگ بین لە سـەر ئەوەی -زانایانیش لەسـەر ئەوەن- کە جۆرێـک لە جۆرەکانی نـامەنگگێڕان و زینـدووکردنەوەی ئەو یـادە پیرۆزە دروسـتە و بێ کێشـەیە، وەک بەڕۆژووبـوون لە ڕۆژانی دووشـەممانـدا، وەک لە صـەحیحی موسـلیمدا هـاتووە کە پێغەمـبەری نازدارمـان (دروودی خـودای لەسـەر بێـت) پرسـیاری لی کـراوە: بـۆچی لە دووشـەممەدا بەڕۆژوو

دەبیت؟ ئەویش فەرموویەتی: (ذاك یوم ولدت فیه، ویوم بعثت - أو أنزل علي فیه -) ئەمە ڕۆژێکە من تیایدا لەدایکبووم و، لەو ڕۆژەدا نێردراوم یان سرووش و نیگای مەقم بۆ ماتووە، بۆیە من بەڕۆژوو دەبم.[1]

بەداخەوە گوێم لە مامۆستایەک بوو بە زۆر دەیویست ئەم بڕگەیە لە دەقەکە بپچڕێنێت و دەیگوت: نا، نا، هیچ پەیوەندییەک لە نێوان بەڕۆژووبوونی دووشەممان و لەدایکبوونی پێغەمبەر نییە و، دەیگوت: مەبەستی پێغەمبەر ئەوەیە کە بڵێت: ئەمە قەدەرە لەو ڕۆژەدا لەدایکبووم، واتە هیچ پەیوەندیی بەسەر ڕۆژووەکەوە نییە، ڕۆژووەکە لەبەر ئەوەیە کە تێیدا کردەوە بەرز دەبێتەوە نەک لەبەر لە دایکبوونی ئەو زاتە.!!

ئازیزەکەم: بەگوێی جەنابت بکەم یان بە گوێی خودی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێت)؟!

---

(١) صحيح مسلم - كتاب الصيام- باب استحباب صيام ثلاثة أيام من كل شهر وصوم يوم عرفة - حديث:٢٠٥١

عن أبي قتادة الأنصاري رضي الله عنه ، أن رسول الله صلى الله عليه وسلم سئل عن صومه ؟ قال: فغضب رسول الله صلى الله عليه وسلم ، فقال عمر رضي الله عنه : رضينا بالله ربا ، وبالإسلام دينا، وبمحمد رسولا ، وببيعتنا بيعة . قال : فسئل عن صيام الدهر؟ فقال : " لا صام ولا أفطر - أو ما صام وما أفطر - " قال : فسئل عن صوم يومين وإفطار يوم ؟ قال : " ومن يطيق ذلك ؟ " قال : وسئل عن صوم يوم، وإفطار يومين ؟ قال : " ليت أن الله قوانا لذلك " قال : وسئل عن صوم يوم ، وإفطار يوم ؟ قال : " ذاك صوم أخي داود - عليه السلام - " قال : وسئل عن صوم يوم الاثنين ؟ قال : " ذاك يوم ولدت فيه ، ويوم بعثت - أو أنزل علي فيه - "

خـــودی پێغەمــبەر (دروودی خـــودای لەســـەر بێــت) لە وەڵامــدا دەفەرمووێــت: بــۆیە بە ڕۆژوو دەبــم چــونکە لەو ڕۆژەدا لەدایکبــووم و، لەو ڕۆژەدا نێردراوم یان سرووش و نیگای مەقم بۆ ماتووە.

بەڵام فەرموودەی دیکەمان مەیە دەفەرمووێت لە دووشـەممان و پێـنج شـەمماندا کردەوەکان بەرز دەبێـتەوە، ئەوە مۆکارێکە و، ئەمەش مۆکارێکە، بۆیە فەرموودەکە پێویست بە تەئویل و تەکەللوف ناکات.



## دوای ئەم خاڵانە دێینە سەر ناوەڕۆکی بابەتەکە

# ئایا مەولوود کردن دروستە یان نا؟!

وەک لە پێشتر باسم کرد، زۆربەی زانایان لە کۆنەوە فەرموویانە یادکردنەوەی مەولوودی خۆشەویست -دروودی خودای لەسەر بێت- دروستە، بەڵکو کۆدەنگی بێدەنگی (الاجماع السکوتی) زانایانی لەسەرە، تا دواتر مەردوو زانای وەک (الشاطبی و الفاکهانی) دێن و دەفەرموون: دروست نییە و بیدعەیە.

بە تێگەیشتنی من نابێت (ابن الحاج وابن تیمیه) بخرێنە نێو لیستی ئەو زانایانەی کە فەرموویانە دروست نییە، چونکە ڕای جیاوازیان هەیە، هەروەک دواتر ڕوونی دەکەینەوە.

کەواتە زانایان دەکرێنە سێ گرووپ:

گرووپی یەکەم: دەڵێن دروستە یادی لە دایکبوونی خۆشەویست بکرێتەوە؛ چونکە کۆدەنگی بێدەنگی (الإجماع السکوتی) زانایان لەسەر دروست بوونی یادی مەولوود هەیە.

گرووپی دووەم: ئیمامی شاطبی و فاکەهانی دەڵێن : یادی لە دایکبوونی خۆشەویست -دروودی خودای لەسەر بێت- دروست نییە.

گرووپی سێیەم: ئیمامی (ابن تیمیه) فەرموویەتی:

(وكذلك ما يحدثه بعض الناس، إما مضاهاة للنصارى في ميلاد عيسى عليه السلام، وإما محبة للنبي صلى الله عليه وسلم، وتعظيمًا. والله قد يثيبهم على هذه المحبة والاجتهاد، لا على البدع- من اتخاذ مولد النبي صلى الله عليه وسلم عيدًا. مع اختلاف الناس في مولده. فإن هذا لم يفعله السلف، مع قيام

المقتضي له وعدم المانع منه لو كان خيرًا. ولو كان هذا خيرًا محضا، أو راجحًا لكان السلف رضي الله عنهم أحق به منا، فإنهم كانوا أشد محبة لرسول الله صلى الله عليه وسلم وتعظيمًا له منا، وهم على الخير أحرص.) [1]

بەكورتى دەڵێت: پێشینان لەگەڵ ئەوەى لە ئێمە زیاتر پێغەمبەریان خۆشویستووە ئەم جۆرە مەولوودەیان نەكردووە و، بیدعەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێت:

مەولوود دوو جۆرە: جۆرى یەكەم : (مضاهاة للنصارى) چاولێكەرى مەسیحییەكانە، چۆن بۆ میلادى مەسیح دەیكەن، ئەگەر موسوڵمانانیش لەبەر چاولێكەرى ئەوان مەولوود بكەن، ئەوە دروست نییە و، لەسەر ئەو كارەیان پاداشت وەرناگرن.

جۆرى دووەم : ئەگەر لەبەر خۆشەویستیى خودا و پێغەمبەرەكەى مەولوود بكەن ئەگەرى ئەوە مەیە خوداى گەورە پاداشتى خێریان لەسەر خۆشەویستییەكەیان بۆ خودا و پێغەمبەرەكەى بداتەوە، نەك لەبەر بیدعەكەیان.

(١) اقتضاء الصراط المستقيم لمخالفة أصحاب الجحيم، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني (المتوفى: ٧٢٨هـ)، المحقق: ناصر عبد الكريم العقل، دار عالم الكتب، بيروت، لبنان، الطبعة السابعة، ١٤١٩هـ - ١٩٩٩م:٢/١٢٣.

# تەوەری بەڵگەکان

## بەڵگەی نەیارانی مەولوود:

**بەڵگەی یەکەم:** دەڵێن: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێت) یادی مەولوودی بۆ خۆی نەکردووە، هاوەڵەکانیش بۆیان نەکردووە، سێ سەدەی زێڕین نەیان کردووە، کەواتە بە هیچ شێوەیەک دروست نییە بکرێت.

وەڵام: ئەم بەڵگەیە موناقەشەی لەسەرە و، پرسیاری زۆر هەڵدەگرێت، ئایا هەرشتێک پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) نەیکردبێت، دروست نییە بیکەیت؟ ئەوە کێشەیە و، زانایان ڕای جیاوازیان لەسەرە، بەڵکو هەتا زانایانی سەردەمیش تا زانایانی سعوودیەش هەندێک کار دەکەن کە بە ئیجماعی زانایان نە پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- کردوویەتی و، نە سەحابە و، نە سەلەفی ساڵح کردوویانە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک لە زانایانی سعوودیە و غەیری سعوودیەش کردوویانە و دەیکەن و دەفەرموون: دروستە و بیدعە نییە.

## لێرەدا ئەم چەند نموونەیە دەخەینە بەردەمی خوێنەری ئازیز:

١- دابەشکردنی تەراویح بۆ دوو بەش، بەشێکیان دوای نوێژی عیشا و، دواخستنی بەشەکەی تر بۆ نیوەی شەو بەدواوە، لە کاتێکدا پێغەمبەر -درودی خودای لەسەر بێت- ئەم کارەی نەکردووە، بەڵام لە هەردوو حەرەمی مەککی و مەدەنیدا دەکرێت و زانایان بە دروستی دەزانن.

٢- تایبەتکردنی دوا دەیەمی کۆتایی مانگی ڕەمەزان بە شەو نوێژکردن، لە کاتێکدا پێغەمبەر-درودی خودای لەسەر بێت- ئەم کارەی نەکردووە، بەڵام لە جیهاندا دەکرێت و زانایانی سعوودیەش ئەنجامی دەدەن.

٣- زیاد کردنی شەو نوێژ –بە تەراویحەوە- لە یازدە ڕکات.

لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە کە عائیشە -دایکی بڕواداران- فەرموویەتی: پێغەمبەری نازدار (دروودی خودای لەسەر بێت) لە شەونوێژدا لە یازدە ڕکات زیاتری نەکردووە.(١)

بۆیە ئەلبانی دەڵێت: دروست نییە زیادەی بخەیتە سەر.(٢)

بەڵام زاناکانی دیکەی وڵاتی سعوودیە و غەیری سعوودیەش دەڵێن: دەکرێت لە یازدە ڕکات زیاتر بکەیت.

٤- بە جەماعەت کردنی شەو نوێژ، سێ سەدەی زێڕین نەیانکردووە، بەڵام ئێستە بە چاوی خۆتان دەیبینن لە هەردوو حەرەمی مەککی و مەدەنی و مزگەوتەکانی جیهاندا دەکرێت و، بە بیدعەش نایدەنە قەڵەم.

٥- خەتمکردنی قورئانی پیرۆز لە شەونوێژی دوا دە شەوی ڕەمەزاندا کە پێغەمبەر –درودی خودای لەسەر بێت- نەیکردووە و، پێشینان نەیانکردووە.

٦- خوێندنی دۆعای خەتمی قورئانی پیرۆز لە نوێژدا لە مانگی ڕەمەزاندا کە پێغەمبەر –درودی خودای لەسەر بێت- نەیکردووە.

---

(١) صحيح البخاري - كتاب الجمعة- أبواب تقصير الصلاة - باب قيام النبي صلى الله عليه وسلم بالليل في رمضان وغيره- حديث:١١٠٨

عن أبي سلمة بن عبد الرحمن ، أنه أخبره : أنه سأل عائشة رضي الله عنها ، كيف كانت صلاة رسول الله صلى الله عليه وسلم في رمضان ؟ فقالت : " ما كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يزيد في رمضان ولا في غيره على إحدى عشرة ركعة يصلي أربعا ، فلا تسل عن حسنهن وطولهن ، ثم يصلي أربعا ، فلا تسل عن حسنهن وطولهن ، ثم يصلي ثلاثا ".

(٢) صلاة التراويح، محمد ناصر الدين الألباني (المتوفى: ١٤٢٠هـ)، الناشر: مكتبة المعارف للنشر والتوزيع – الرياض، الطبعة: الأولى - ١٤٢١هـ: ١٢٢.

گوێ بگرن لە زانایەکی ناوداری وەک (ابن عثيمين) پرسیاری لەم بارەوە لێدەکرێت:

**سئل فضيلة الشيخ: عن حكم دعاء ختم القرآن في قيام الليل في شهر رمضان؟**

**فأجاب فضيلته بقوله: لا أعلم في ختمة القرآن في قيام الليل في شهر رمضان سنة عن النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ولا عن أصحابه أيضاً وغاية ما ورد في ذلك أن أنس بن مالك - رضي الله عنه -: "كان إذا ختم القرآن جمع أهله ودعى" وهذا في غير الصلاة... ولكن بعض أهل العلم قال إنه يستحب أن يختم القرآن بهذا الدعاء.[1]**

دەڵێت: (نازانم کە پێغەمبەر –دروودی خودای لە سەر بێت- یان هاوەڵان کردبێتیان، تەنها ئەوە هاتووە ئەنەسی کوڕی مالیک کە قورئانی خەتم دەکرد ماڵ و منداڵی بۆ خوێندنی دوعا کردن کۆدەکردەوە، بەڵام ئەم دوعایە لە دەرەوەی نوێژ بووە نەک لە ناو نوێژدا، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك ئەهلی عیلم گوتویانە باشە (مستحب)ە بکرێت).

٧- کۆبوونەوەی ساڵانە (الملتقيات السنويه)، بۆ نموونە کۆبوونەوە و کۆنگرە دەکرێت بۆ ڕێزگرتن و باسکردنی زانایەک، لە کاتێکدا ئەم جۆرە کارە نە لە زەمانی پێغەمبەری –دروودی خودای لەسەر بێت- کراوە و، نە لە زەمانی هاوەڵان و، نە لە زەمانی تابعين و تابعی تابعين و نە لە ماوەیەکی زۆری

---

(١) مجموع فتاوى ورسائل فضيلة الشيخ محمد بن صالح العثيمين، محمد بن صالح بن محمد العثيمين (المتوفى: ١٤٢١هـ)، جمع وترتيب : فهد بن ناصر بن إبراهيم السليمان، الناشر : دار الوطن - دار الثريا، الطبعة : الأخيرة - ١٤١٣ هـ:١٤/٢١٢-٢١٣

دواتــریش مەبــووە، لەگەڵ ئەوەشــدا بە بەردەوام لە زانکۆکاکــانی جیهــانی ئیسلامیدا ئەم جۆرە گردبوونەوە ئەنجام دەدرێت.

لە زانکـۆی (الإمــام محمد بــن ســعود) لە وڵاتــی شانشــینی ســعوودیە مەفتەیەکی تەواویان بۆ زانایەکی وەک (محمد بن عبدالوهاب) تەرخان کرد و، بەلایشیانەوە بیدعە نەبوو.!

بـۆیە ئەم کارەیان بـووە جێی مشـتومڕ و پرسـیار و گومـان، خەڵکانێـک مـاتن پرسـیاریان کـرد و گوتیـان: ئەرێ زانایـان، گردبـوونەوەی مەفـتەیەک و یــادکردنەوەی (محمدی کــوڕی عبــدالوهاب) بە دروســت دەزانــن، بەڵام یـادکردنەوەی تەنهـا ڕۆژێکـی (محمدی کـوڕی عبـدالله) بە دروسـت نـازانن و، ڕۆژێکیشتان پێ زیادە و، دروست نییە؟ ئەم بانە و دوو مەواییەتان لە چی؟!

مەنــدێک لەو زانــا بەڕێــزانە وەڵامیــان دانەوە، بەڵام بەداخەوە وەڵامەکانیان موقنیع نییە.

یەک لەو زانایـانە (شـیخ ابـن العثیمـین - رحـمه الله -)، پرسـیاری جیـاوازیی مەفـتەی (محمد بن عبد الوهـاب) و یـادی مەولـوودی لێدەکرێت، بۆ یەکەمیان بە بیدعە نازانن، بەڵام دووەمیان بیدعەیە؟ لە وەڵامدا دەڵێت:

(الفرق بینهما حسب علمنا من وجهین:

الأول: أن أسـبوع الشـیخ محمد بن عبـد الوهـاب -رحمـه الله تعـالی- لم یتخذ تقربًا إلی الله -عز وجل- وإنما یقصد به إزالة شبهة في نفوس بعض النـاس في هذا الرجل، ویبین ما من الله به علی المسلمین علی ید هذا الرجل.

الثاني: أسبوع الشيخ محمد بن عبد الوهاب -رحمه الله- لا يتكرر ويعود كما تعود الأعياد، بل هو أمر بين للناس وكتب فيه ما كتب، وتبين في حق هذا الرجل ما لم يكن معروفًا من قبل لكثير من الناس ثم انتهى أمره.[1]

دەڵێت: لە دوو ڕووەوە جیاوازی هەیە لە نێوان یادی پێغەمبەر و یادی (محمد بن عبد الوهاب):

ڕووی یەکەم: مەفتەی شێخ (محمد بن عبد الوهاب) نەکراوەتە مەبەست بۆ نزیکبوونەوە لە خودا (لم يتخذ تقربًا إلى الله -عز وجل-)، بەڵکو بە مەبەستی ڕەواندنەوەی گومان لە دڵی کەسانێک کە بەرامبەر ئەم پیاوە هەیانە و، بۆ دەرخستنی ئەو چاکە و منەتانەی خودا کە لەسەر دەستی ئەم پیاوە لەگەڵ موسوڵماناندا کردوویەتی، واتە بۆ دەرخستنی فەزڵی ئەم پیاوەیە بەسەر موسوڵماناندا.!!

بەڕاستی لاوازیی ئەم وەڵامە لە شان و شکۆی کەسێکی وەک (ابن عثیمین) ناوەشێتەوە، باشە، ئەگەر ئەم کارە بۆ نزیکبوونەوە لە خودا ناکەن ئیتر بۆچی دەیکەن.!!

هەروەها کۆبوونەوەی موسوڵمانان لە یادی مەولووددا ئەگەر بۆ باسکردن و دەرخستنی فەزڵی پێغەمبەر –دروودی خودای لەسەر بێت- و، ڕەواندنەوەی گومان لە سەر زاتی موبارەک و ئەنوەری نەبێت بۆچی دەکرێت؟!

(١) مجموع فتاوى الشيخ ابن عثيمين: ٢/٣٠٠

بۆ دەبێت کۆبوونەوە و تەرخانکردنی هەفتە بۆ باسکردنی فەزڵی (محمد بن عبد الوهاب) دروست بێت، بەڵام کۆبوونەوە و تەرخانکردنی تاکە ڕۆژێکیش بۆ باسکردنی پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- دروست نەبێت؟!

بۆ دەبێت کۆبوونەوە و تەرخانکردنی هەفتە بۆ ڕەواندنەوەی گومان لەسەر (محمد بن عبد الوهاب) دروست بێت، بەڵام کۆبوونەوە و تەرخانکردنی تاکە ڕۆژێکیش بۆ ڕەواندنەوەی گومان لەسەر زاتی پیرۆزی پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- دروست نەبێت؟!

ڕووی دووەم: دەڵێت: هەفتەی (محمد بن عبدالوهاب) وەک جەژن دووبارە ناکرێتەوە، هەفتەیەک بوو باسی چاکەی ئەم پیاوە کراوە و بڕاوەتەوە.!!

ئەم وەڵامەش بە هەمان شێوە لاوازە و موقنیع نییە، چونکە ئەوە دەگەیەنێت: کە کۆبوونەوە بۆ یادکردنەوە و باسکردنی کەسێک دروستە بە مەرجێک دووبارە نەبێتەوە، کەواتە مەولوودیش ئەگەر دووبارەی نەکەیتەوە دروستە و بیدعە نییە، واتە بەلایەوە دروستە هەر وەک چۆن یادەوەریی (محمد بن عبد الوهاب) کراوە یادەوەریی ئاوەهاش بۆ (محمد بن عبد الله) بکەین، بەڵام بە مەرجێک دووبارەی نەکەینەوە، بۆ نموونە من لە تەمەنم جارێک بیکەم، تۆش لە تەمەنت جارێک بیکەیت؟ نەخێر، هەر بەلایەوە دروست نییە! ئەی باشە تۆ دەفەرموویت دووبارە نەبێتەوە، باشە ئێمەش دووبارەی نەکەینەوە، دروستە؟ نەخێر، دروست نییە، ئەی بۆچی بۆ (محمد بن عبد الوهاب) دروستە؟!! نازانم.!!

کەواتە مەولود نەگێڕانی پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- بۆ خۆی نابێتە بەڵگە بۆ ئەوەی بڵێین: مەولوود دروست نییە، هەروەک چۆن

پێغەمبەری ئازیزمان ئەو هەموو کارەی نەکردووە کە باسمان کرد بەڵام زانایانی سعوودیە دەیکەن و بە بیدعەی نازانن.

**بەڵگەی دووەم:** دەڵێن: ڕۆژی لەدایکبوونی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) هەمان ڕۆژی وەفاتیەتی، باشە چۆن دەکرێت لە ڕۆژی وەفاتدا دڵت خۆش بێت.

وەڵام: بە ڕاستیی ئەم جۆرە قسە تێکەڵکردنی بابەتەکانە .

ئیمام سیووطی – رحمه الله – زۆر بە جوانی وەڵامی ئەم جۆرە بەڵگە دەداتەوە و دەفەرمووێت: ((إن ولادته –صلى الله عليه وسلم- أعظم النعم)) دەفەرمووێت: لەدایکبوونی پێغەمبەر گەورەترین نیعمەتە بە سەر موسوڵمانانەوە . ((ووفاته أعظم المصائب)) وەفاتیشی گەورەترین ناخۆشیی و موصیبەتە، بەڵام ئایا شەرع هانی یاکردنەوەی خۆشیەکان دەدات، یان ناخۆشیەکان؟ پێشەوا (سیوطی) دەفەرمووێت: (والشريعة حثت على إظهار شكر النعم) شەریعەت هانمان دەدات بۆ دەرخستنی شوکری نیعمەتەکان، وەک پەروەردگار دەفەرمووێت:﴿ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴿١١﴾ ﴾ الضحى: ١١ باسی نیعمەتەکانی پەروەردگارت بکە، نەیفەرمووە: (وأما بمصيبة ربك فحدث) باسی ناخۆشیی و نەمامەتیەکان بکە، ئینجا دەفەرمووێت (والصبر عند المصائب) فەرمانی کردووە کە لە کاتی موسیبەتدا ئارام بین، (وقد أمر الشرع بالعقيقة عند الولادة وهي إظهار شكر وفرح بالمولود) دەڵێت: شەرع فەرمانی کردووە لە کاتی منداڵبووندا حەوتم بکەین و حەیوان سەر ببڕین لە بەر ئەوەی دڵمان خۆش بێت و ، ئەو نیعمەتە دەربخەین و شوکری خودای گەورە بکەین، (ولم يأمره

عند الموت بذبح ولا غيره) بەڵام لە كاتی مردندا فەرمانی نەكردووە حەیوان سەر ببڕین، چونكە موصیبەتە (بل نهى عن النياحة وإظهار الجزع) بەڵكو شەرع لێی قەدەغە كردووین ماوار بكەین و لە خۆمان بدەین و دڵتەنگیمان ئاشكرا بكەین بۆ ئەوەی خەڵک وابزانێت ئێمە لە فەرمانی خودا ناڕازین.

ئینجا لە ئیبن رەجەبی حەنبەلیەوە دەگێڕێتەوە كە لە كتێبی (لطائف)دا لۆمەی ئەو كەسانەی كردووە كە ساڵانە موصیبەتی عاشورا زیندوو دەكەنەوە و، دەفەرمووێت: بە ڕاستی ئەمە سەرپێچی شەرعە، بۆ؟ چونكە فەرمان نەهاتووە ئێمە وەفاتی پێغەمبەران زیندوو بكەینەوە.[1]

یەحیا پێغەمبەر سەربڕاوە، پێغەمبەر زەكەریا بە مشار لەتكراوە، پێغەمبەرمان هەیە كوژراوە، پێغەمبەرمان هەیە وەفاتی كردووە، ناكرێت بۆ هەر یەكێک لەم پێغەمبەرانە بۆنەیەک دیاری بكەین و یادەكەی زیندوو بكەینەوە، بەڵام دەفەرمووێت: ئێمە لە شەرعدا خۆشییەكان زیندوو دەكەینەوە نەک ناخۆشیەكان.

**دوا قسە:** كاتێک دەڵێن: لەبەر ئەوەی پێغەمبەر -درووی خودای لەسەر بێت – نەیكردووە كەواتە كردنی بیدعەیە، كە بیدعەش بوو خاوەنی بیدعەكە دەبێتە بیدعەچی و گومڕا.

---

(١) بڕوانە: سبل الهدى والرشاد، في سيرة خير العباد، وذكر فضائله وأعلام نبوته وأفعاله وأحواله في المبدأ والمعاد- محمد بن يوسف الصالحي الشامي (المتوفى: ٩٤٢هـ)، تحقيق وتعليق: الشيخ عادل أحمد عبد الموجود، الشيخ علي محمد معوض، دار الكتب العلمية بيروت – لبنان، الطبعة: الأولى، ١٤١٤ هـ - ١٩٩٣م:١/٣٧١.

ئێمەش دەڵێین: لەمەو پێش باسی ئەوەمان کرد مەرج نییە مەرجی پێغەمبەر -درووی خودای لەسەر بێت - نەیکردووە بیدعە بێت و، مەرج نییە ئەگەر کارێک بەلای زانایەکەوە یان چەند زانایەکەوە بیدعە بێت لە هەقیقەتدا بیدعە بێت و، مەرج نییە ئەگەر کارێک بەلای زانایەکەوە دروست بێت و، بە لای زانای دیکەوە بیدعە بوو خاوەنی ئەو کارە ناوی بیدعەچی لێ بنرێت، خۆ ئەگەر هەر کارێک کە زانایەک ناوی بیدعەی لێنا و زانایەکی تر بە دروستی زانی ئەم زانایەی کە بە دروستی زانیوە بە بیدعەچی و گومڕا بدرێتە قەڵەم، یەک زانات بە دەستەوە نامێنێتەوە، بەڵکو گشتیان دەبنە بیدعەچی و گومڕا.

لێرەدا چەند نموونەیەکتان لەو بابەتە بۆ دەخەمە بەردەست:

١- تازیە دانان (مجالس العزاء) نە پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- کردوویەتی و، نە هاوەڵانیش کردوویانە، (ابن عثيمين -فوزان- ألباني) دەڵێن: بیدعەیە، بەڵام (ابن باز - ابن جبرين) دەڵێن: دروستە، کەواتە بەلای (ابن عثيمين - فوزان - ألباني)یەوە (ابن باز- ابن جبرين) بیدعەچین، کەواتە بەو مانایە دەبێت بڵێین گومڕان، ئایا دەتوانیت و دەوێریت پێیان بڵێیت: بیدعەچی و گومڕا.؟! نەخێر ناتوانیت.

٢- هەفتانەی دایک و باوک کە دەمرن (عشاء الوالدين) واتە کاتێک باوک یا دایک دەمرێت دوای هەفتەیەک حەوتمیان بۆ دەکرێت، یان دوای مانگێک؛ حەیوانێک بە نیەتی خێر بۆ باوک و دایک سەر دەبڕن، نە پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- کردوویەتی و نە هاوەڵانیش کردوویانە، (ابن عثيمين) دەفەرمووێت بیدعەیە. (ابن باز - ابن جبرين - فوزان) دەڵێن: بیدعە نییە و دروستە.

٣- تەرخان کردنی ڕۆژی مەینی بۆ زیارەتی گۆڕستان، نە پێغەمبەر – درروودی خودای لەسەر بێت- کردوویەتی و، نە هاوەڵانیش کردوویانە. بەلای (ابن باز – ابن عثیمین – فوزان) بیدعەیە و دروست نییە، بەڵام (ابن جبرین) دەڵێت: دروستە.

٤- تەسبیح بگریت بە دەستەوە بۆ زیکری خودا، بەلای (فوزان – ألبانی)یەوە دروست نییە و بیدعەیە، بەلای (ابن باز – ابن عثیمین – ابن جبرین)ەوە: دروستە و بیدعە نییە.

٥- دووبارەکردنەوەی عومرە لە مانگی ڕەمەزاندا، نە پێغەمبەر –درروودی خودای لەسەر بێت- کردوویەتی و نە هاوەڵانیش کردوویانە. بەلای (ابن عثیمین) بیدعەیە، بەڵام (ابن باز – فوزان – لیژنەی دائیمە بۆ فەتوا لە سعودیە) دەڵێن: هیچی تێدا نییە و دروستە .

٦- دۆعای خەتمی قورئان لە نوێژدا، نە پێغەمبەر –درروودی خودای لەسەر بێت- کردوویەتی و نە هاوەڵانیش کردوویانە. بەلای (ألبانی – بکر أبو زید – ابن عثیمین)ەوە: نەسڵی نییە، بەڵام (ابن باز- ابن جبرین- فوزان) و (ابن عثیمین) لە قەولێکی دیکەدا دەڵێن: بەڵێ، دروستە.

٧- بە قورئان دەستپێکردنی ئامەنگ و بۆنەکان، نە پێغەمبەر –درروودی خودای لەسەر بێت- کردوویەتی و نە هاوەڵانیش کردوویانە، (بکر ابو زید- عفیفی- ابن عثیمین) دەڵێن: نەسڵی نییە، (فوزان-ألبانی) دەڵێن: دروستە .

٨- خۆ لەراندنەوە لە کاتی قورئان خوێندندا، نە پێغەمبەر –درروودی خودای لەسەر بێت- کردوویەتی و، نە هاوەڵانیش کردوویانە، (بکر ابو زید) دەڵێت: دروست نییە، بەڵام (ابن عثیمین) دەڵێت: دروستە و بیدعە نییە.

٩- کاتێک نوێژ دەکەیت قورئان بگریت بەدەستەوە یا لە بەردەمتدا دایبنێیت و لەسەری بخوێنیت؛ نە پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- کردوویەتی و، نە هاوەڵانیش کردوویانە، (ألباني) دەڵێت: دروست نییە، بەڵام (ابن باز- ابن عثيمين- ابن جبرين-فوزان) دەڵێن: بیدعە نییە و دروستە.

١٠- نامەنگێڕان بۆ ئەوانەی قورئانیان لەبەرە، نە پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- کردوویەتی و، نە هاوەڵانیش کردوویانە، (ألباني- لیژنەی دائمەی فەتوا) دەڵێن: دروست نییە، بەڵام (ابن عثيمين- فوزان) دەڵێن: دروستە.

١١- ماچکردنی قورئانی پیرۆز، نە پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- کردوویەتی و، نە هاوەڵانیش کردوویانە، (ابن عثيمين – ألباني -لجنە دائمە) دەڵێن: دروست نییە، بەڵام (ابن باز – فوزان) دەڵێن: دروستە.

١٢- وێناکردنی هێڵێک لە سەر فەرشی مزگەوت بۆ ڕێزکردنی ڕیزەکان، نە پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- کردوویەتی و، نە هاوەڵانیش کردوویانە، (ألباني) دەڵێت بیدعەیە، بەڵام (ابن عثيمين – فوزان – عفيفي- لیژنەی دائمە) دەڵێن: هیچی تێدا نییە و بیدعە نییە.

١٣- میحرابدانان لە مزگەوتدا، (ألباني) دەڵێت: دروست نییە، بەڵام (ابن باز- ابن عثيمين- فوزان لیژنەی دائمە) دەڵێن: دروستە.

١٤- بێدەنگیی ئیمام لە دوای خوێندنی سوورەی فاتیحە، (ألباني – فوزان لە ڕایەکدا) دەڵێن: دروست نییە، بەڵام (فوزان لە ڕایەکی دیکەدا و لیژنەی دائیمە) دەڵێن: دروستە.

١٥- دەستگرتن دوای هەستانەوە لە ڕکووعدا، (ألباني) لە (صفة صلاة النبي)دا دەڵێت: هیچ گومانم لەوە نییە کە دەست خستنە سەر سنگ لە

دوای هەستانەوە لە ڕکووعدا بیدعە و گومڕاییە (ولست أشك في أن وضع اليدين على الصدر في هذا القيام بدعة ضلالة؛ لأنه لم يرد مطلقاً في شيء من أحاديث الصلاة - وما أكثرها! -، ولو كان له أصل؛ لنقل إلينا ولو عن طريق واحد، ويؤيده أن أحداً من السلف لم يفعله، ولا ذكره أحد من أئمة الحديث فيما أعلم. [1] بەڵام (ابن باز- ابن عثيمين- فوزان) دەڵێن: دروستە.

١٦- کردنی زیاتر لە یازدە ڕکات نوێژکردن لە شەوانی ڕەمەزاندا، (ألباني) دەڵێت: دروست نییە، بەڵام (ابن باز- ابن جبرين- ابن عثيمين- فوزان) دەڵێن: دروستە.

١٧- ڕیش درێژکردن زیاتر لە مشتێک، (ألباني) دەڵێت: دروست نییە، بەڵام (ابن باز- ابن جبرين- ابن عثيمين- فوزان) دەڵێن: دروستە.

١٨- کۆڕبەندی ڕێزنان لە زانایان، نە پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- کردوویەتی و نە هاوەڵانیش کردوویانە، بەڵام نازانم کەس بە بیدعە و حەرامی دانابێت.

١٩- تایبەتکردنی دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان بە نوێژی هەستانەوە (صلاة القيام) نەمانبینیوە کەس بە حەرام و بیدعەی بزانێت.

٢٠- پیرۆزبایکردن بە هاتنی ساڵی کۆچی، نە پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- کردوویەتی و نە هاوەڵانیش کردوویانە، (الفوزان) دەڵێت: دروست نییە، بەڵام (ابن باز- ابن عثيمين- ابن جبرين) دەڵێن: دروستە.

---

(١) أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم، محمد ناصر الدين الألباني (المتوفى: ١٤٢٠هـ)، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع – الرياض، الطبعة: الأولى ١٤٢٧ هـ - ٢٠٠٦ م: ٧٠١/٢.

٢١- مەڵبژاردنی چەند بەروارێکی دیاریکراو بۆ باسکردنی چەند بۆنەیەکی دیاریکراو، (الفوزان) دەڵێت: دروست نییە، بەڵام (ابن عثیمین) دەڵێت: دروستە.[(١)]

## ئەنجامی بەڵگەکان:

دوای تاوتوێکردنی بەڵگەکان ئەم خاڵانەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:

**یەکەم:** بەڵگەکان لە سەر دروست نەبوونی یادکردنەوەی مەولوود بەڵگەی تایبەت نین، بەڵکو بەڵگەی گشتیین.

**دووەم:** بەڵگەکان (قطعي الدلالة والثبوت) نین تا ببنە یەکلاکەرەوەی ئەم بابەتە و، بەو شێوەی کە دەیبینین و دەیبیستین هێرشی گەورە بکرێتە سەر ئەوانەی بەلایانەوە یادی مەولوود دروستە و، بە گومڕا و بیدعەچی وەسف بکرێن.

بەم جۆرە بەڵگەی نەیارانی مەولوود کۆتایی پێ دەهێنین و، دێینە سەر بەڵگەی ئەو زانایانەی مەولوودیان بەلاوە دروستە.

## بەڵگەکانی لایەنگرانی مەولوود:

هەندێک لەو زانایانەی مەولوودیان بەلاوە دروستە، هەندێک جار بۆ ڕەوادان بە مەولوود پشتیان بە فەرموودەی لاواز و هەڵبەستراو بەستووە، ئێمە لێرەدا ئەو جۆرە دەقانە پشتگوێ دەخەین و باسیان ناکەین، بەڵام چەند بەڵگەی جوان و دروستیان هەیە وەک:

---

(١) بڕوانە پەڕتووکی: مفهوم البدعة، د. عبد الإله بن حسين العرفج، دار الفتح-الطبعة الثانية-١٤٣٣هـ-٢٠١٢م: ٣٦٠-٣٦١.

**بەڵگەی یەکەم:**

کاتێک بۆ یەکەمجار یادی مەولوود کرا زانایان بە کۆدەنگی بێ دەنگی (إجماعی سکوتی) بەلایانەوە دروست بوو.

بەڵام وەک باسمان کرد ئیجماعی سکووتی مشتومڕی زۆری لە سەرە و، زانایان پتر لە دوازدە ڕای جیاوازیان لەسەر هەیە ،[1] گەر حوججە و بەڵگەش بێت ئەوا حوججەیەکی قەتعی و یەکلاکەرەوە نییە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئیجماعی سکووتی بەڵگەیەکی کارپێکراوی بەهێزە و جێی متمانەی زۆربەی زانایانە.

**بەڵگەی دووەم:** ئایەتی سوورەتی یونس دەفەرمووێت: ﴿ قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ﴾ یونس: ٥٨، واتە: ئەی محەممەد، بڵێ تەنها بە فەزڵی خودا و بە ڕەحمی خودا دڵیان خۆش بێت، ئەوە باشتر و خێرترە لەوەی کە کۆیدەکەنەوە.

نکووڵیش لەوە ناکرێت کە خۆشەویست -دروودی خودای لەسەر بێت- ڕەحمەت و فەزڵی خودایە بەسەر جیهانەوە، بۆیە ئیمامی (سیوطی) دەفەرمووێت: فەزڵ یان قورئانە یان زانست و عیلمە، بەڵام ڕەحمەت پێغەمبەری خودایە، ئەم ڕاڤەیەش دەداتە پاڵ (ابن عباس) و دەڵێت: (ابن عباس) فەرموویەتی: مەبەست لە (ڕەحمەت) پێغەمبەرە -دروودی خودای

(١) إرشاد الفحول إلي تحقيق الحق من علم الأصول، محمد بن علي بن محمد بن عبد الله الشوكاني اليمني (المتوفى: ١٢٥٠هـ)، المحقق: الشيخ أحمد عزو عناية،دار الكتاب العربي، الطبعة: الطبعة الأولى ١٤١٩هـ - ١٩٩٩م: ١/٢٢٣-٢٢٦.

لەسـەر بێـت-، چـونکە خـودای گەورە دەفەرمووێـت: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾الأنبياء: ١٠٧

لێرەدا مەنـدێك لەو زانایـانەی نەیاری مەولـوودن و بەلایـانەوە بیدعەیە دەڵـێن: ناکرێـت وشـەی فەزڵ و ڕەحـمەت بە پێغەمـبەر ڕاڤە بکـرێن، چـونکە (ابن عباس) دەڵێت: (فەزڵ) لەو دەقەدا ئیسلامە و (ڕەحمەتیش) قورئانە.!

بەڵام ئەم وەڵامە زۆر لاوازە، چـونکە لە لایەکەوە خـودای گەورە مەردوو وشـەی فەزڵ و ڕەحمەتی بە ڕەمایی مێناوە و دیاریی نەکردووە، بۆیە ناکرێت تەنها لە مانایەکدا کورت بکرێنەوە، ئەو جۆرە ڕاڤەیش کە لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕدرێتەوە بـۆ گەمـارۆدان و قـۆرخکردن و کـورتکردنەوەی وشـەکان نییە لەو مانایـانەدا، بەڵکـو ئەمە جـۆرە تەفسـیرێکە پێی دەگوترێـت: تەفسـیری نمـوونەیی، بـۆ نمـوونە خـودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿غير المغضـوب علـيهم والضـالين﴾ پێغەمبەرمـان -دروودی خـودای لەسـەر بێـت- فەرمـوویەتی: (المغضـوب علـيهم) جـوولەکەن، و (الضـالين) گاورەکـانن، بەڵام مەبەسـتی خۆشەویسـت -دروودی خـودای لەسـەر بێت- گەمـارۆدان و کـورتکردنەوەی ئەو دوو وشـە نییە لە جوولەکە و گاوراندا، بەڵکو جوولەکە و گاور نموونەن بـۆ مەبەسـت لەو دوو وشـە، چـونکە تەنهـا ئەوان تـووڕە لێبـوو و گـومڕا نـین، ئەوەتـا خـودای گەورە باسـی بکـوژی کەسـی بێتـاوان دەکات و، لە سـوورەتی النسـاء دەفەرمووێـت: ﴿ وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدٗا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمٗا ٩٣ ﴾ النساء: ٩٣

هەر کەسێك موسوڵمانێك بە عەمدی بکوژێت ئەوە جەزاکەی دۆزەخێکە هەتاهەتایە تێیدا دەمێنێتەوە و، خودا ڕقی لێی هەڵئەستێت و نەفرینی لێ دەکات و سزایەکی گەورەی بۆ ئامادە کردووە.[1]

هەروەها کاتێک باسی پێنجەم سوێندی خێزانی تۆمەتبار بە زینا دەکات لە (لعان) دا دەفەرمووێت: ﴿ وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٩﴾ ﴾ النور: ٩

دەفەرمووێت: لە پێنجەم شایەتیدا با بڵێت غەزەبی خودای لێ بێت کە ئەگەر درۆ بکات.

لە لایەکی دیکەوە یاسایەکی ئوصوڵیمان مەیە دەڵێت: (تعليق الحكم بالمشتق مؤذن بعليه ما منه الاشتقاق) هەر کاتێک حوکمێک پەیوەست بوو بە شتێکی موشتەقەوە چاوگی ئیشتیقاقەکە (مصدر الاشتقاق) دەبێتە عیللەت، ئا لێرەدا (رحمة) خۆی چاوگە، ئەو کاتە گشت ڕەحمەتێک دەگرێتەوە: پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- ڕەحمەتە، ئیسلام ڕەحمەتە، قورئان ڕەحمەتە، سوننەت ڕەحمەتە، هیدایەت ڕەحمەتە، خێزانی چاک و بڕوادار ڕەحمەتە ... هتد.

بۆیە ئەگەر بڵێین: تەنها مەبەستی ئیسلام و قورئانە، کەواتە بە هیچ شێوەیەک دروست نییە دڵت بە پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- خۆش بێت، موسوڵمان شتی وا ناڵێت، باوەڕ ناکەم موسوڵمان هەبێت بوێرێت بڵێت: دروست نییە دڵت بە پێغەمبەر-دروودی خودای لەسەر بێت- و لەدایکبوونی و ژیانی موبارەکیی خۆش بێت.

(١) خوڵاصەی تەفسیری نامی -ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا-چاپی دووەم: لاپەڕە ٩٣.

**بەڵگەی سێیەم:** پێغەمبەری ئازیز -دروودی خودای لەسەر بێت- بە بەڕۆژوو بوون یادی لەدایکبوونی خۆی کردووە و، سوپاسگوزاریی خودای کردووە، کاتێکیش پرسیاری لێدەکرێت بۆ ڕۆژانی دوو شەممە بەڕۆژوو دەبیت؟ ئەویش لە وەڵامدا دەفەرمووێت: ((ذلک یوم ولدت فیه)) ڕۆژی دووشەممە ئەو ڕۆژەیە کە من تێیدا لەدایکبووم، بۆیە دەکرێت بە قیاس لەسەر ئەو کارەی پێغەمبەر-دروودی خودای لەسەر بێت- ئەو یادە پیرۆز بکرێتەوە، بۆیە زانایان فەرموویانە مادام پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- یادی لەدایکبوونی خۆی بەو شێوازە کردووەتەوە ئێمەش بۆمان هەیە قیاس بکەینە سەری و، بە هەر شێوازێکی شەرعی بێت ئەو یادە بکەیتەوە، لە هەمان کاتیشدا دەتوانیت بەڕۆژوو بیت.

**بەڵگەی چوارەم:** عوروە -وەک لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە- بۆمان دەگێڕێتەوە، کە کەسێک لە خزمانی پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- ئەبو لەهەبی لەخەودا بینیوە -لە هەندێک ڕیوایەتی تردا هاتووە کە عەباسی مامی پێغەمبەر (دروودی خودای لە سەر بێت) بینیویەتی- و، پرسیاری لێکردووە: حاڵت چۆنە؟ ئەویش گوتوویەتی: هیچ خۆشی وخێرێکم نەبینیوە، بەڵام لە بەر خاتری ئەوەی کەنیزەکێکم هەبوو ناوی (سوەیبە) بوو کاتێک موژدەیان پێدام و گوتیان خێزانی (عبد الله)ی برام (واتە باوکی پێغەمبەر) منداڵێکی بووە، ئەوەندە دڵم خۆش بوو یەکسەر کەنیزەکەکەم ئازاد کرد، بۆیە کەمێک ئاوم دراوەتێ، واتە: لەبەر خاتری دڵخۆش بوونی بە لەدایکبوونی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کەمێک ئاوی پێ خەڵات دەکرێت.

(ابـن الجـزری) دەڵێـت: ئەگەر ئەمە حـاڵی ئەبـو لەهەبی کافر بێـت کە قورئـان زەمـی کـردووە لە نـاگردا پاداشـتی خۆشـحاڵیی بە لەدایکبـوونی خۆشەویستمان دەربڕیوە، ئەی دەبێت حاڵی ئەو موسوڵمانە یەکتاپەرستەی ئـوممەتەکەی چـۆن بێـت کە بە لەدایکبـوونی دڵخۆشـە و ئەوەی لە توانایـدا بێت بۆ دەربڕینی خۆشەویستیی بۆی درێغی ناکات.[1]

بەڵام نەیارانی مەولوود لە وەڵامدا دەڵێن: ئەم فەرموودەش مورسەلە و بە موعەللەقی لە بوخاریدا هاتووە، هەر چەندە زۆر لە زانایان بەرگریان لە ئیمامی بوخاری کردووە و، گوتوویانە موعەللەقاتی بوخاریی حوکمی مەوصوولیان هەیە، با نەچینە سەر ئەو وردەکاریە زانستیە چونکە زۆر کەس لێی حاڵی نابن.

هەروەها نەیارانی مەولوود دەڵێن: ئەم فەرموودەیە لە گەڵ ئەوەی کە مورسەلە، خەونە نەک ڕاستیی، خەونیش حوکمی شەرعیی لێ وەرناگیرێت.

**بەڵگەی پێنجەم:** ئیسلام زۆر گرنگیی بە زیندووکردنەوەی بۆنە جوانەکان داوە، گەر سەیری حەج بکەین دەبینین زۆربەی کارەکان بریتین لە زیندووکردنەوەی بۆنەی جوان.

---

(١) قال ابن الجزری: فإذا كان هذا أبو لهب الكافر، الذی نزل القرآن بذمه جوزی فی النار بفرحه ليلة مولد النبی- صلى الله عليه وسلم- به، فما حال المسلم الموحد من أمته- عليه السّلام- الذی يسر بمولده، ويبذل ما تصل إليه قدرته فی محبته صلى الله عليه وسلم-. المواهب اللدنية بالمنح المحمدية، أحمد بن محمد بن أبی بكر بن عبد الملك القسطلاني، أبو العباس، شهاب الدين (المتوفى: ٩٢٣هـ)، المكتبة التوفيقية، القاهرة- مصر: ٨٨/١.

هاجەرە خاتوون –سەلامی خودای لێ بێت- سەعی نێوان صەفا و مەروەی کردووە، موسوڵمانانیش لە کاتی ئەنجامدانی مەراسیمی حەجدا وەک ئەو سەعی دەکەن.

هاجەرە خاتوون –سەلامی خودای لێ بێت- ئاوی زەمزەمی خواردووەتەوە، موسوڵمانانیش ئاوی زەمزەم دەخۆنەوە.

بۆ ڕێزنان لە مەقامی ئیبراهیم –سەلامی خودای لێ بێت- خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴾ البقرة: ١٢٥

مەقامی ئیبراهیم بکەنە نوێژگە و پەرستگاتان.

هەروەها خودای گەورە زۆربەی کاری پێغەمبەرانی بۆ گێڕاوینەتەوە و، ئەو یادانەی بۆ زیندووکردووینەتەوە، بۆیە خودای گەورە بە مووسا پێغەمبەر –دروودی خودای لەسەر بێت- دەفەرمووێت: ڕۆژانی خودایان بیر خەرەوە ﴿ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِ ﴾ سورة إبراهيم:٥.هەر چەندە ئەم ئایەتە باس لە ڕۆژانی ڕزگارکردنی پێغەمبەر مووسا دەکات، بەڵام ڕستەکە گشتییە و دەتوانیت بە گشتیی بیهێڵیتەوە، یاسای ئوصولیش دەڵێت: (العبرة بعموم اللفظ لا بخصوص السبب).

**بەڵگەی شەشەم:** دەیەما دەق قورئانی و فەرموودە لە سەر کۆبوونەوە بۆ یاد و زیکری خودای گەورە هەیە، (الاجتماع على ذكر الله) هەر کۆبوونەوەیەکیش لە بەر خاتری خودا بێت و یادی خودا و خۆشەویستانی خودای تێدا بکرێت خودای گەورە فریشتەی ڕەحمەتیان بۆ دەنێرێتە خوارەوە و، لە گوناهەکانیان خۆش دەبێت.

گومـانیش لەوەدا نیـیە یـادکردنەوەی پێغەمـبەری ئـازیزیش –دروودی خـودای لێ بێـت- لە بەر خـاتری خـودایە و، گەر خۆشەویستیی خـودا نەبوایە، ئێمەش خۆشمان نەدەویست و یادمان نەدەکرد.

**بەڵگەی حەوتەم:** کاتێک حەوارییەکان داوا لە عیسا پێغەمبەر دەکەن –دروودی خـودای لێ بێـت- لە خـودا بپاڕێتەوە بۆ ئەوەی سـفرە و خوانێکیان لە ئاسمانەوە بۆ دابەزێنێت، دواتر عیسا پێغەمبەر –دروودی خـودای لێ بێت- دەفەرمووێـت: ﴿ رَبَّنَآ أَنزِلْ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ تَكُونُ لَنَا عِيدًا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا وَءَايَةً مِّنكَ وَٱرْزُقْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿١١٤﴾ ﴾ المائدة: ١١٤

پەروەردگارا خوانێکمـان بۆ دابەزێنە بۆ ئەوەی ببێتە جەژن و شـادیی بۆ بەرودوامان.

جـا ئەگەر دابەزینی سـفرە و خوانێـک ببێتە هۆی جەژنگێڕان و شـادیی و خۆشـیی، ئیتر چـۆن لەدایکبـوونی فەخـری کائینـات نـابێتە هۆکاری خۆشـیی و شـادیگێڕان؟! خـۆ بـاوەڕ نـاکەم بوێریـت بڵێیـت: عیسـا پێغەمـبەر –دروودی خـودای لێ بێـت- هەڵەی کـردووە، یـاخود بڵێیـت: دڵخۆشـبوون بـۆ سـفرە و خـوان دروسـتە بەڵام دڵخۆشـبوون و شـادیگێڕان بـۆ پێغەمـبەری ئیسـلام و نووری دیدە و تاجی سەرمان –دروودی خودای لێ بێت- دروست نییە.

هەروەهـا خـاڵێکی گرنـگ هەیە پێویسـتە بیزانین، ئەویش ئەوەیە زانایـانی کـۆن زیـاتر لە (سـەد) پەرتووکیـان لە سـەر ڕەوایی و دروسـت بـوونی مەولـوود گێڕان نووسیوە، لێرەدا چەند نموونەیەک دەهێنینەوە:

١. المورد الهني في مولد السني، الحافظ العراقي عبد الرحيم بن الحسين بن عبد الرحمن، المتوفى ٨٠٦هـ

٢. التنوير، في مولد السراج المنير، لأبي الخطاب: عمر بن الحسن، المعروف بابن دحية الكلبي المتوفى ٦٠٤هـ
٣. جامع الآثار، في مولد المختار، للحافظ، شمس الدين محمد بن ناصر الدين الدمشقي المتوفى: سنة ٨٤٢ هـ. (هەروەها لەسەر مەولوود دوو پەرتووکی تریشی هەیە).
٤. الدَرّ المنظم فِي المولد الْمُعظم لأبي الْقَاسِم مُحَمَّد بن الإِمَام أبي الْعَبَّاس أَحْمد ابْن مُحَمَّد بن أَحْمد اللَّخمِيّ العزفي السبتي
٥. حسن المقصد، في عمل المولد للجلال السيوطي
٦. عرف التعريف، في المولد الشريف للشيخ، شمس الدين: محمد بن محمد بن الجزري.
٧. المورد الروي، في المولد النبوي لعلي القاري.
٨. المولد النبوي بقي بن مخلد بن يزيد، الاندلسي المتوفى ٢٧٦هـ
٩. اشرف الانام في مولد مصباح الظلام، عبد الوهاب بن علي بن عبد الكافي السبكي، المتوفى ٧٧١هـ
١٠. مولد النبي صلى الله عليه وسلم، اسماعيل بن عمر بن كثير، ابن كثير، المتوفى ٧٧٤هـ
١١. ارتشاف الطرب في مولد سيد العجم والعرب، محمد بن احمد بن علي، ابن جابر الهواري، المتوفى ٧٨٠هـ
١٢. كنز الراغبين العفاة، في الرمز إلى المولد المحمدي والوفاة للشيخ، برهان الدين، أبي إسحاق: إبراهيم بن محمد الشافعي، الدمشقي.المتوفى: سنة ٩٠٠.

١٣. مولد سيد الاولين والآخرين، محمد بن محمد بن عمر بحرق ابن مبارك الحضرمي المتوفى: ٩٣٠هـ
١٤. مولد النبي صلى الله عليه وسلم ، محمد بن احمد, الخطيب الشربيني، المتوفى ٩٧٧هـ
١٥. مولد النبي صلى الله عليه وسلم، محمد بن احمد بن علي, الغيطي، المتوفى ٩٨١هـ
١٦. اللآلىء الزاهرات والفصوص الفائقات في ذكر مولد النبي صلى الله عليه وسلم، محمد بن محمد مجدوب, الفقي، المتوفى بعد ١٠١٢هـ
١٧. رساله في استحسان المولد النبوي، ابوبكر بن ابي القاسم بن احمد, ابن الاهدل المتوفى ١٠٣٥هـ
١٨. المولد النبوي، محمد علي بن محمد علان بن ابراهيم, ابن علان، المتوفى ١٠٥٧هـ
١٩. عقد الجوهر في مولد صاحب الحوض والكوثر، جعفر بن حسن بن عبد الكريم, البرزنجي، المتوفى ١١٧٧هـ
٢٠. مولد النبي الكريم صلى الله عليه وسلم، عبد الكريم بن احمد بن علوان, الشراباتي، المتوفى ١١٧٨هـ
٢١. المنهل العذب الهني في مولد النبي القرشي المدني، محمد بن عبد الكريم, السمان المتوفى: ١١٨٩هـ
٢٢. فتح العليم الستار المنجي على قصه المولد للعلامه البرزنجي، عبد الله بن علي بن يوسف, الفارسي المتوفى بعد ١٢٦٢هـ
٢٣. الترياق المسلسل في مولد النبي المرسل، محمد بن مصطفى بن حسن, الخضري، المتوفى ١٢٨٧هـ

٢٤. الكوكب المنير في مولد البشير النذير، محمداسعد بن محمدارسلان بن حسن، ابن رسلان المتوفى: بعد ١٣١٥هـ

٢٥. المولد النبوي، جعفر بن اسماعيل بن زين العابدين، البرزنجي، المتوفى ١٣١٧هـ

٢٦. اليمن والاسعاد بمولد خير العباد، جعفر بن ادريس الحسني، الكتاني المتوفى ١٣٢٣هـ

٢٧. لسان الرتبه الاحديه في مولد الحضره المحمديه، محمود بن مصطفى، ابوالشامات المتوفى: ١٣٤١هـ

٢٨. الهدي التام في موارد المولد النبوي وما اعتيد فيه من القيام، محمد علي بن حسين بن ابراهيم، المالكي المتوفى ١٣٦٧هـ



## ڕاستکردنەوەی شێواندنی مەڵوێستی دوو زانای گەورە و ناودار لە مەڕ مەولوود کردن:

**یەکەمیان: (ابن الحاج)**

بە داخەوە زۆر لەوانەی نەیاری مەولوودن و دەڵێن مەولوود دروست نییە، لە پەرتووک و نووسراو و وتارەکانیاندا دەڵێن: (ابن الحاج) گوتوویەتی: یادکردنەوەی دروست نییە و بیدعەیە، بەڵام بە گەڕانەوە بۆ کتێبەکەی (ابن الحاج) بۆمان دەردەکەوێت کە نەیفەرمووە یادکردنەوەی مەولوود دروست نییە و بیدعەیە، بەڵکو دەفەرمووێت: یادی مەولوود مونکەر و گوناهی تێدا دەکرێت، نابێت ئەو مونکەرانە بمێنن، بەڵکو دەبێت لا ببرێن و نەهێڵرێن، بەڵام لە هەمان کاتدا دەفەرمووێت: دەتوانیت بەخۆشیی یادی مەولوودەوە بە شێوازێکی شەرعیی ئامەنگ بگێڕیت و خێر و چاکە و صەدەقە بکرێت، هەروەها دەفەرمووێت: نەک ئەو ڕۆژەی کە خۆشەویست –دروودی خودای لەسەر بێت- تیایدا لەدایکبووە، بەڵکو دەبێت: ڕێز لەو مانگە و لە سەرتاسەری ئەو مانگە بگیرێت و یادی لە دایکبوونی خۆشەویست بکرێت –دروودی خودای لەسەر بێت-، ئەمەش دەقی قسە شیرینەکانی (ابن الحاج)ە:

(فَعَلَى هَذَا فَتَعْظِيمُ هَذَا الشَّهْرِ الشَّرِيفِ إنَّمَا يَكُونُ بِزِيَادَةِ الْأَعْمَالِ الزَّاكِيَاتِ فِيهِ وَالصَّدَقَاتِ إلَى غَيْرِ ذَلِكَ مِنْ الْقُرُبَاتِ فَمَنْ عَجَزَ عَنْ ذَلِكَ فَأَقَلُّ أَحْوَالِهِ أَنْ يَجْتَنِبَ مَا يَحْرُمُ عَلَيْهِ وَيُكْرَهُ لَهُ تَعْظِيمًا لِهَذَا الشَّهْرِ الشَّرِيفِ وَإِنْ كَانَ ذَلِكَ مَطْلُوبًا فِي غَيْرِهِ إلَّا أَنَّهُ فِي هَذَا الشَّهْرِ أَكْثَرُ احْتِرَامًا كَمَا يَتَأَكَّدُ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ وَفِي الْأَشْهُرِ الْحُرُمِ فَيَتْرُكُ الْحَدَثَ فِي الدِّينِ وَيَجْتَنِبُ مَوَاضِعَ الْبِدَعِ وَمَا لَا يَنْبَغِي.

وَقَدْ ارْتَكَبَ بَعْضُهُمْ فِي هَذَا الزَّمَانِ ضِدَّ هَذَا الْمَعْنَى وَهُوَ أَنَّهُ إِذَا دَخَلَ هَذَا الشَّهْرُ الشَّرِيفُ تَسَارَعُوا فِيهِ إلَى اللَّهْوِ وَاللَّعِبِ بِالدُّفِّ وَالشَّبَّابَةِ وَغَيْرِهِمَا كَمَا تَقَدَّمَ. فَمَنْ كَانَ بَاكِيًا فَلْيَبْكِ عَلَى نَفْسِهِ وَعَلَى الْإِسْلَامِ وَغُرْبَتِهِ وَغُرْبَةِ أَهْلِهِ وَالْعَامِلِينَ بِالسُّنَّةِ). [١]

دەڵێت: بەڕاستی ڕێز لێنان و بەگەورەزانینی ئەم مانگە بەوەیە کردەوەی چاک و صەدەقات زیاد بکەیت و گشت کردەوەیەک کە لە پەروەردگارت نزیک بکاتەوە ئەنجامی بدەیت، کەسێک نەتوانێت ئەم کارە بکات با بە لایەنی کەمەوە خۆی دوورە پەرێز بگرێت لە گوناه و کاری ناشیاو.

لێرەدا (ابن الحاج) پێمان دەفەرمووێت با بە کاری خێر یادی مەولوود بکەین، دیارە کاری خێر پانتاییەکی زۆری هەیە و گشت کارێکی چاک دەگرێتەوە وەک: مەژار و نەدار دەوڵەمەند بکەیت، ڕووت و برسی تێر و پۆشتە بکەیت، یارمەتی خەڵک بدەیت، دڵی خەڵک خۆش بکەیت، دەمیان شیرین بکەیت و، قورئان بخوێنیت و، سوننەتی پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێت- باس بکەیت و زیندوو بکەیتەوە (فَمَنْ عَجَزَ عَنْ ذَلِكَ فَأَقَلُّ أَحْوَالِهِ أَنْ يَجْتَنِبَ مَا يَحْرُمُ عَلَيْهِ وَيُكْرَهُ لَهُ تَعْظِيمًا لِهَذَا الشَّهْرِ الشَّرِيفِ وَإِنْ كَانَ ذَلِكَ مَطْلُوبًا فِي غَيْرِهِ إلَّا أَنَّهُ فِي هَذَا الشَّهْرِ أَكْثَرُ احْتِرَامًا كَمَا يَتَأَكَّدُ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ وَفِي الْأَشْهُرِ الْحُرُمِ)

دەفەرمووێت: کەمترین ڕێزلێنان لەم مانگە ئەوەیە ئەگەر ئەو کارانەت بۆ نەکرا خۆت لە گوناه دووربخەیتەوە، هەر چەندە خۆدوورخستنەوە لە

---

(١) المدخل، أبو عبد الله محمد بن محمد بن محمد العبدري الفاسي المالكي الشهير بابن الحاج (المتوفى: ٧٣٧هـ) دار التراث، بدون طبعة وبدون تاريخ:٢/٤.

گوناه لە مانگەکانی دیکەش واجبە، بەڵام دەبێت لەم مانگەدا زیاتر مەوڵ بدەین خۆمان لە تاوان و گوناه دووربخەینەوە، چونکە ئەم مانگە ڕێزی زیاترە لە مانگەکانی دیکە، وەک چۆن لە مانگی ڕەمەزان و مانگە حەرامەکاندا چاکەکردن زیاتر جەختی لەسەر دەکرێت).

دواتر دەفەرمووێت: (فَيَتْرُكُ الْحَدَثَ فِي الدِّينِ وَيَجْتَنِبُ مَوَاضِعَ الْبِدَعِ وَمَا لَا يَنْبَغِي.)

دەبێت بەتایبەت لەم مانگەدا خۆی لە داهێنان لە دین بپارێزێت و نزیکی جێگای بیدعە و کاری نادروست نەبێتەوە، (وَقَدْ ارْتَكَبَ بَعْضُهُمْ فِي هَذَا الزَّمَانِ ضِدَّ هَذَا الْمَعْنَى وَهُوَ أَنَّهُ إِذَا دَخَلَ هَذَا الشَّهْرُ الشَّرِيفُ تَسَارَعُوا فِيهِ إِلَى اللَّهْوِ وَاللَّعِبِ بِالدُّفِّ وَالشَّبَّابَةِ وَغَيْرِهِمَا كَمَا تَقَدَّمَ. فَمَنْ كَانَ بَاكِيًا فَلْيَبْكِ عَلَى نَفْسِهِ وَعَلَى الْإِسْلَامِ وَغُرْبَتِهِ وَغُرْبَةِ أَهْلِهِ وَالْعَامِلِينَ بِالسُّنَّةِ).

بەڕاستیی هەندێك کەس لەم زەمانەدا دژی ئەم مانایە کار دەکەن، بەوەی کە ئەم مانگە پیرۆزە دێت پێشبڕکێیانە لە ڕابواردن و گەمە و گاڵتە بە دەف و شمشاڵ و شتی دیکە، جا ئەوەی دەگری و فرمێسک دەڕێژێت با بۆ خۆی و بۆ ئیسلام و بێنازی ئیسلام و غوربەتی و غوربەتی شوێنکەوتووانی و ئەوانەی بە سوننەتی پێغەمبەر –دروودی خودای لەسەر بێت –کار دەکەن، بێت.

هەزار ڕەحمەتی لێبێت: بەڕاستی لە هەندێک وڵاتی وەک میسر و سودان ئەو خۆشیە پیرۆزەی ئەو مانگە پیرۆزە بە ڕابواردن و کاری ناشەرعیی و بیدعە و هەڵپەرکێی تێکەڵی پیاو و ژن بەسەر دەبرێت، إنا لله وإنا إليه راجعون.

## دووەمیان: مەڵوێستی (ابن حجر العسقلانی)

مەندێک لە نەیارانی مەولوود ڕای زانای گەورە (ابن حجر العسقلانی) بە نیوەناچڵی باس دەکەن، دەڵێن: گوتوویەتی: مەولوود بیدعەیە، لە کاتێکدا وای نەگوتـــووە، بەڵکـــو فەرمـــوویەتی: بیـــدعەیەکی حەســـەنەیە، واتە: دامێنراوێکی باشـە، خودی ئەم زانایە کتێبێکی تایبەتی بۆ ئەم بابەتە تەرخان کـردووە، تێیـدا دەفەرمووێـت: مەولـوود دامێنراوێکی باشـە و، دەفەرمووێت: مەر چەندە دانراوێکی باشە بەڵام من بەڵگەم بۆ دۆزیـوەتەوە و تەنصیلم بۆ کردووە.

دەفەرمووێـت: پێغەمـبەری نازیزمـان (دروودی خـودای لە سـەر بێـت) کاتێک چووە مەدینە بینی جوولەکەکان لە ڕۆژی عاشورادا بەڕۆژوو دەبوون، پرســیاری مۆکـاری ئەم بەڕۆژووبـوونەی لێکـردن، گوتیـان: ئەمە ئەو ڕۆژەیە خودای گەورە مووسا پێغەمبەر –سەلامی خودای لێ بێت- و باوەڕدارانی تێدا لە دەستی فیرعەون ڕزگار کـرد، پێغەمـبەر –دروودی خـودای لە سـەر بێـت- فەرمـووی: (نحـن اولى بموسـى مـنكم فصـامه وامـر بصـيامه) نیتر ئەویـش بەڕۆژوو بوو و، فەرمانی بەڕۆژوو بوونی عاشـوورای فەرموو، لە دواییـدا (ابن حجر) دەفەرمووێت: ڕزگارکردنی مووسا پێغەمبەر –سەلامی خودای لێ بێت- نیعمەتێکی خـودایە، لەدایکبـوونی پێغەمـبەریش –دروودی خـودای لە سـەر بێت- نیعمەتێکی خودایە، ئێمەش دەتوانین قیاسی بکەینە سەری.

## دوا پەیام:

دوای تاوتوێکردنی بەڵگەکان دەمانەوێت کورتەی ئەنجام و دوا پەیامەمان لە چەندخاڵێکدا کۆ بکەینەوە:

**خاڵی یەکەم:** بابەتی مەولوود بابەتێکی قەتعیی و بڕاوە نییە و، بەڵگەی یەکلاکەرەوەی لەسەر نییە بیگەیەنێتە ئاستێک یەکتری پێ تەفسیق و تەبدیع و گومڕا بکەین، بۆیە ئاساییە ڕایەکیان هەڵبژێریت، بەڵام بەمەرجێک کێشە بۆ ڕای بەرامبەر نەنێیتەوە.

**خاڵی دووەم:** شادیی مەولوود و کۆبوونەوە بۆ دەربڕینی خۆشحاڵیی بە بۆنەی لەدایکبوونی فەخری کائنات دروستە، بەڵام دەبێت دوور بێت لە گوناه و ناشەرعیی.

**خاڵی سێیەم:** زۆربەی زانایانی کۆن لەسەر ئەوەن کە یادی مەولوود ڕەوایە و دروستە، بۆیە لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامیدا بە بەردەوام کراوە و زۆربەی زانایان بەشداریان کردووە.

ئیمامی (القسطلانی) لە (ابن الجزری)یەوە دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێت: "ولا زال أهل الإسلام يحتفلون بشهر مولده (عليه السلام)، ويعملون الولائم، ويتصدّقون في لياله بأنواع الصدقات، ويظهرون السرور، ويزيدون في المبرّات، ويعتنون بقراءة مولده الكريم، ويظهر عليهم من بركاته كلّ فضل عظيم.. فرحم الله امرئاً اتّخذ ليالي شهر مولده المبارك أعياداً، ليكون أشدّ علّة على من في قلبه مرض وأعيا داء"[(١)]

(بەردەوام موسوڵمانان ئاهەنگیان لە مانگی مەولووددا بە بۆنەی لە دایکبوونی خۆشەویستەوە –دروودی خودای لەسەر بێت- گێڕاوە و دەگێڕن، سفرە و خوان دەڕازێننەوە و داواتی تێدا دەکەن و، خێر و صەدەقە دەکەن و، خۆشیی و شادیی دەردەبڕن، کرداری چاکە زیاد دەکەن، سیرەت و

(١) المواهب اللدنية للقسطلاني:١/٨٩.

ژياننامەی ئەو خۆشەویستە دەخوێننەوە و، بە ئاشکرا ئاسەواری بەرەکەتیان لێ دەردەکەوێت...)

**خاڵی چوارەم:** زۆر بەداخەوە لەبری ئەوەی وەک ئەمەک و وەفایەک بۆ نووری دیدە و تاجی سەرمان هەمیشە خۆشەویستیی ئەو زاتە کۆمان بکاتەوە و بیکەینە هەوێنی ئەوین و مەرهەمی برینەکانمان؛ بەڵام بە پێچەوانەوە ئەوەندەی کێشەمان لەسەر ئەو ناوەتەوە لەگەڵ کەسێکی دیکەدا وا مامەڵەمان نەکردووە.

بەلایانەوە دروستە زاراوەی (جلالة الملك) بۆ بەندەیەکی گوناهکار بەکاربهێنن، بەڵام لەسەر وشەی (سیدنا) بۆ سەروەری سەروەران و پێشەنگی جیهان کێشە و گرفت دەخولقێنن و یەکتر دەبیدعێنن، لە کاتێکدا بە هەرچی هەرچیی و پەرچیی دونیا هەیە دەگوترێت (سیدنا).

هەروەها بەلای هەندێک لایەن و کەسایەتییەوە دیاریکردن و تەرخانکردنی ڕۆژێک بۆ نیشتیمان و، هەفتەیەک بۆ محەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب دروست و بێ کێشەن، بەڵام دیاریکردنی ڕۆژێک بۆ پێغەمبەری ئازیز -دروودی خودای لەسەر بێت- دروست نییە و بیدعەیە.!!

**خاڵی پێنجەم:** زانایەکی سەلەفی وەک (بەربەهاری) لە کتێبی (شرح السنة)دا هەندێک قسە بەرامبەر بیدعەچی و خاوەن بیدعە لە هەندێك زانای وەک (فضیل بن عیاض) دەگێڕێتەوە، وەک:

- (لە گەڵ خاوەن بیدعەدا دامەنیشە ئەترسم نەفرەتی خودات بۆ دابەزێت.

- هەرکەسێک خاوەن بیدعەیەکی خۆش بوێت خودای گەورە کردەوەکانی پووچەڵ دەکاتەوە و، نووری ئیسلام لە دڵیدا دەردێنێت.

- ئەگەر خاوەن بیدعەیەکت لە ڕێگایەکدا بینی تۆ بەو ڕێگایەدا مەڕۆ.

- ئەوەی بۆ خاوەن بیدعەیەک پێدەکەنێت ئەوە سووکایەتی بەو قورئانە کردووە کە بۆ محەممەد –دروودی خودای لە سەر بێت- دابەزیوە.

- لەگەڵ جوولەکە و گاوردا نان دەخۆم، نەک لەگەڵ بیدعەچیدا.

- ئەوەی سووکایەتی بە خاوەن بیدعەیەک بکات ئەوە خودای گەورە سەد پلە لە بەهەشتدا بەرزی دەکاتەوە). [1]

## چەند تێبینییەکمان لە سەر ئەم قسانە هەیە:

**تێبینیی یەکەم:** لەبەر ئەوەی سەر لە خەڵکی نەشێوێنین نابێت لە بابەتێکی وەک مەولووددا ئەو جۆرە دەقانە بهێنینەوە، چونکە ئەو قسانە قسەی هەندێک زانان، نەک فەرموودەی پێغەمبەر –دروودی خودای لەسەر بێت-، وەک ئاشکراشە قسەی زانایەک با پلەو پایەی لە هەموو زاناکانی تریش بەرزتر بێت نابێتە بەڵگە و، ناگاتە ئاستی فەرموودەی پێغەمبەر –دروودی خودای لە سەر بێت-، چونکە فەرموودەی پێغەمبەر –دروودی خودای لە سەر بێت- حوججە و بەڵگەیە نەک قسەی مرۆڤی تر، بە تایبەت هەندێك بابەت هەیە لە خاوەن شەرعەوە نەبێت وەرناگیرێت؛ چونکە باسی غەیب دەکات، وەک ئەو قسەی کە دەڵێت: بە ڕقبوون لە خاوەن بیدعەیەک سەد پلە لە بەهەشتدا بەرز دەبیتەوە.

(١) شرح السنة للإمام أبي محمد الحسن بن علي بن خلف البهاري المتوفى سنة ٣٢٩هـ-تحقيق وتعليق عبد الرحمن بن أحمد الجميري-مكتبة دار المنهاج- الرياض-الطبعة الأولى-سنة ١٤٢٦هـ: ص١٣٣ وما بعدها.

**تێبینیی دووەم:** ئایا پێوەر چیە بۆ جیاکردنەوەی بیدعەکان، ئایا ئەو قسانە گشتاندنیان بۆ دەکرێت و هەموو بیدعەیەک دەگرێتەوە یان تایبەتن بە چەند بیدعەیەکی دیاریکراوە وەک بیدعەی عەقیدە.؟

ئەگەر گشتاندنیان بۆ دەکەیت، ئەو کاتە زانات بە دەستەوە نامێنێت، هەموویان یان زۆربەیان کەم تا زۆر هەندێک ڕایان هەیە کە زانای دیکە بە بیدعەیان زانیوە، بۆ نموونە ئەگەر دەڵێیت: هەر کەس مەولوود بە دروست بزانێت بیدعە چیە دەبێت سەدەها زانا و زیاتر بە بیدعەچی بزانیت، وەک: (الحافظ ابن حجر العسقلانی و الحافظ السخاوی والحافظ السیوطی والحافظ العراقی و الحافظ ناصر الدین الدمشقی و القارئ إبن الجزری و...).!

ئایا دەوێریت بڵێیت ئەو زانایانە بیدعەچی و گومڕان و، دروست نیيە قسەیان لەگەڵدا بکەیت، دەبێت ڕقت لێیان بێت و سووکایەتیان پێ بکەیت، هەرکەسێک ئەو زانایانەی خۆش بوێت خودای گەورە کردەوەکانی پووچەڵ دەکاتەوە و، نووری ئیسلام لە دڵیدا دەردەهێنێت و، هەر کەسێک ڕقی لێیان بێت سەد پلە لە بەهەشتدا بەرز دەبێتەوە.

ئایا دەوێریت ئەلبانی و ئیبن باز و ئیبن جبرین و ئیبن عوسەیمین و ئیبن فەوزان و هتد.. کە وەک لە پێشەوە باسمان کرد هەر یەکێکیان چەند بیدعەیەکی هەیە بە بیدعەچی و خاوەن بیدعە بزانیت و بڵێیت دەبێت ڕقمان لێیان بێت و سووکایەتیان پێبکەین و بەو ڕقە سەد پلە لە بەهەشتدا بەرز دەبینەوە.!!

ئایا ئەو زانا و قوتابی زانست و خەڵکانەی کە مەولوودیان بەلاوە دروستە بە بیدعەچی دەزانیت و ئەو حوکمە توندەیان بە سەردا دەدەیت.

دینی خودا شەرمی ناوێت، دووڕوویی ناوێت، بە ئاشکرا وەرە پێشەوە و بڵێ: بەڵێ من ڕقم لە هەموویانە و بە گومڕایان دەزانم، یاخود بە بانێک و دوو مەوا وەڵام بدەرەوە و، بڵێ: تەنها ئەو زانایانەی مەولوودیان بەلاوە دروستە بە گومڕا و بیدعەچی دەزانم، بەڵام زاناکانی سعودیە با بیدعەیشیان هەبێت پاداشت لەسەر بیدعەکانیان وەردەگرن، چونکە ئیجتهادیان کردووە.!.

بۆیە پێت دەڵێم: **لماذا باؤكَ تجرُّ وبائي لا تجرُّ؟.**

ئەگەر پرسیاری پێناسەی سووننە و بیدعە لە زانایەکی وەک ئەم بەربەهاریە بکەیت لە وەڵامدا لەبری قورئان و سووننەت کتێبەکەی خۆی دەکاتە پێوەر و پێت دەڵێت ئەوەی باوەڕی بە کتێبەکەی بێت و گومانی لە یەک پیتی نەبێت بڕوادار و خاوەن سووننەتە و، ئەوەی باوەڕی بە هەمووی یان پیتێکی نەبێت یان بوەستێت لەسەری ئەوە شوێنکەوتەی هەواو ئارەزوویە و، لە دین دەردەچێت و کافر دەبێت هەر وەک چۆن کەسێک باوەڕی بە پیتێکی قورئان نەبێت وایە.

لێرەدا دوو دەقی قسەی بەربەهاریتان لەسەر دەمارگیریی تێڕوانینی بەربەهاریی لە چەمکی بیدعەدا بە بێ دەستکاریی دەخەینە ڕوو:

دەقی یەکەم: بەربەهاریی دەڵێ: (فمن أقر بما في هذا الكتاب وآمن به واتخذه إماما، ولم يشك في حرف منه، ولم يجحد حرفا واحدا، فهو صاحب سنة وجماعة، كامل، قد كملت فيه السنة، ومن جحد حرفا مما في هذا الكتاب، أو شك [في حرف منه أو شك فيه] أو وقف فهو صاحب هوى. ومن جحد أو شك في حرف من القرآن، أو في شيء جاء عن رسول الله صلى الله عليه وسلم، لقي الله تعالى مكذبا، فاتق الله واحذر وتعاهد إيمانك).[1]

(١) شرح السنة: ص ١٣٢.

دەقی دووەم: (فاتق الله، وعليك بالأمر الأول العتيق، وهو ما وصفت لك في هذا الكتاب، فرحم الله عبدا، ورحم والديه قرأ هذا الكتاب، وبثه وعمل به ودعا إليه، واحتج به، فإنه دين الله ودين رسول الله صلى الله عليه وسلم، فإنه من انتحل شيئا خلاف ما في هذا الكتاب، فإنه ليس يدين لله بدين، وقد رده كله، كما لو أن عبدا آمن بجميع ما قال الله تبارك وتعالى، إلا أنه شك في حرف فقد رد جميع ما قال الله تعالى، وهو كافر، كما أن شهادة أن لا إله إلا الله لا تقبل من صاحبها إلا بصدق النية وخالص اليقين، كذلك لا يقبل الله شيئا)[1]

لە کاتێکدا ئەم کتێبە چەندەها قسەی هەڵە و دەقی هەڵبەستراو بەدەمی پێغەمبەرەوەی تێدایە و، باوەڕ ناکەم گەر بە پێوەری ئەم کتێبە بێت موسوڵمانێکی بڕوادار لەسەر زەویدا بە بڕوادارێی بمێنێتەوە و کافر نەبێت.!!

بۆ نموونە:

دەڵێت: (ولكل نبي حوض إلا صالح النبي صلى الله عليه وسلم؛ فإن حوضه ضرع ناقته)[2]

گشت پێغەمبەرێک حەوزێکی هەیە جگە لە صاڵح پێغەمبەر نەبێت گوانی حوشترەکەی دەبێتە حەوز بۆی.

ئەم دەقە نەک فەرموودەیەکی لاوازە بەڵکو زانایانی فەرموودە وەک ابن الجوزی و ابن حجر العسقلاني[3] فەرموویانە: درۆ و هەڵبەستراوە بەدەم

(١) شرح السنة: ص ١٠٣.

(٢) شرح السنة: ص ٤٥.

(٣) قال الحافظ ابن الجوزي: هَذَا حَدِيث مَوْضُوع لَا أَصْلَ لَهُ. الموضوعات، جمال الدين عبد الرحمن بن علي بن محمد الجوزي (المتوفى: ٥٩٧هـ)، ضبط وتقديم وتحقيق: عبد

پێغەمبەرەوە، بەڵام بەلای بەربەهارییەوە گەر باوەڕیت پێی نەبێت لە دین دەردەچیتە دەرەوە و کافر دەبیت.!

- هەروەها دەڵێت: "والإيمان بأن مع كل قطرة ملك ينزل من السماء حتى يضعها حيث أمره الله عز وجل".[1]

واتە: لەگەڵ هەر دڵۆپە بارانێک فریشتەیەک دادەبەزێت تاوەکو لەو جێگا دایدەنێت کە خودا فەرمانی پێکردووە.

- هەروەها دەڵێت: "واعلم أن أول من ينظر إلى الله في الجنة الأضراء، ثم الرجال، ثم النساء، بأعين رؤوسهم".[2]

واتە: یەکەم کەس سەیری خودا دەکەن نابیناکانن، لە پاشان پیاوان، ئەوجا ژنان.

با ئیتر ئەو برایانە کەم موسوڵمانان بە بیدعەچی و گومڕا وەصف بکەن و بیدعەی خۆیان و زاناکانیان پەردەپۆش بکەن.

لە کۆتاییدا لە پەروەردگار دەپاڕێمەوە ئەم نووسینە ببێتە هۆی نەهێشتنی دوو بەرەکی و ناکۆکی موسڵمانان و، بە ڕەحمەتی خۆی لە منیش و

---

الرحمن محمد عثمان، المكتبة السلفية بالمدينة المنورة، الطبعة: الأولى، ١٣٨٨ هـ - ١٩٦٨ م: ٢٤٥/٣

وقال الحافظ ابن حجر العسقلاني: قلت: هو موضوع. لسان الميزان، أبو الفضل أحمد بن علي بن محمد بن أحمد بن حجر العسقلاني (المتوفى: ٨٥٢هـ)، المحقق: عبد الفتاح أبو غدة، دار البشائر الإسلامية، الطبعة: الأولى، ٢٠٠٢ م: ٢٤٣/٥.

(١) شرح السنة : ص ٧٧.

(٢) شرح السنة : ص ٨٦.

لە هەموو برایەکی بڕوادار بە بێ پۆلێن کردنیان بۆ گرووپ و کۆمەڵ و دەستە و تاقم –با ڕای جیاوازیشیان بێت- خۆش ببێت.

**سبحان ربك رب العزة عما يصفون وسلام على المرسلين وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين**

**وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم**



# سەرچاوەکان

١- إرشاد الفحول إلي تحقيق الحق من علم الأصول، محمد بن علي بن محمد بن عبد الله الشوكاني اليمني (المتوفى: ١٢٥٠هـ)، المحقق: الشيخ أحمد عزو عناية،دار الكتاب العربي، الطبعة: الطبعة الأولى ١٤١٩هـ - ١٩٩٩م.

٢- أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم، المؤلف: محمد ناصر الدين الألباني (المتوفى: ١٤٢٠هـ)، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع – الرياض، الطبعة: الأولى ١٤٢٧ هـ - ٢٠٠٦ م.

٣- الاعتصام، إبراهيم بن موسى بن محمد اللخمي الغرناطي الشهير بالشاطبي (المتوفى: ٧٩٠هـ)، تحقيق: سليم بن عيد الهلالي، الناشر: دار ابن عفان، السعودية، الطبعة: الأولى، ١٤١٢هـ - ١٩٩٢م.

٤- اقتضاء الصراط المستقيم لمخالفة أصحاب الجحيم، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني (المتوفى: ٧٢٨هـ)، المحقق: ناصر عبد الكريم العقل، دار عالم الكتب، بيروت، لبنان، الطبعة السابعة، ١٤١٩هـ - ١٩٩٩م.

٥- الجامع المسند الصحيح المختصر من أمور رسول الله صلى الله عليه وسلم وسننه وأيامه = صحيح البخاري، محمد بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري، المحقق: محمد زهير بن ناصر الناصر، دار طوق النجاة، ترقيم ترقيم محمد فؤاد عبد الباقي- الطبعة: الأولى، ١٤٢٢هـ

٦- خۆلاصەی تەفسیری نامی -ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا-چاپی دووەم.

٧- سبل الهدى والرشاد، في سيرة خير العباد، وذكر فضائله وأعلام نبوته وأفعاله وأحواله في المبدأ والمعاد، محمد بن يوسف الصالحي الشامي (المتوفى: ٩٤٢هـ)،

تحقيق وتعليق: الشيخ عادل أحمد عبد الموجود، الشيخ علي محمد معوض، دار الكتب العلمية بيروت – لبنان، الطبعة: الأولى، ١٤١٤ هـ - ١٩٩٣م.

٨- شرح السنة للإمام أبي محمد الحسن بن علي بن خلف البهاري المتوفى سنة ٣٢٩هـ-تحقيق وتعليق عبد الرحمن بن أحمد الجميري-مكتبة دار المنهاج- الرياض- الطبعة الأولى-سنة ١٤٢٦هـ

٩- صحيح مسلم، مسلم بن الحجاج أبو الحسن القشيري النيسابوري (المتوفى: ٢٦١هـ) المحقق: محمد فؤاد عبد الباقي، دار إحياء التراث العربي – بيروت.

١٠- صلاة التراويح، محمد ناصر الدين الألباني (المتوفى: ١٤٢٠هـ)، الناشر: مكتبة المعارف للنشر والتوزيع – الرياض، الطبعة: الأولى - ١٤٢١هـ

١١- فتح المجيد شرح كتاب التوحيد، عبد الرحمن بن حسن بن محمد بن عبد الوهاب بن سليمان التميمي (المتوفى: ١٢٨٥هـ)، المحقق: محمد حامد الفقي، مطبعة السنة المحمدية، القاهرة، مصر، الطبعة: السابعة، ١٣٧٧هـ/١٩٥٧م.

١٢- لسان الميزان، أبو الفضل أحمد بن علي بن محمد بن أحمد بن حجر العسقلاني (المتوفى: ٨٥٢هـ)، المحقق: عبد الفتاح أبو غدة، دار البشائر الإسلامية، الطبعة: الأولى، ٢٠٠٢ م.

١٣- مجموع الفتاوى، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني (المتوفى: ٧٢٨هـ)، المحقق: عبد الرحمن بن محمد بن قاسم، نشر مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف، المدينة النبوية، المملكة العربية السعودية،عام النشر: ١٤١٦هـ/١٩٩٥م.

١٤- مجموع فتاوى ورسائل فضيلة الشيخ محمد بن صالح العثيمين، محمد بن صالح بن محمد العثيمين (المتوفى: ١٤٢١هـ)، جمع وترتيب : فهد بن ناصر بن إبراهيم السليمان، الناشر : دار الوطن - دار الثريا، الطبعة : الأخيرة - ١٤١٣ هـ.

١٥- محمد حامد الفقي في تعليقه على فتح المجيد.

١٦- المدخل، أبو عبد الله محمد بن محمد بن محمد العبدري الفاسي المالكي الشهير بابن الحاج (المتوفى: ٧٣٧هـ) دار التراث، بدون طبعة وبدون تاريخ.

١٧- مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح، المؤلف: علي بن (سلطان) محمد، أبو الحسن نور الدين الملا الهروي القاري (المتوفى: ١٠١٤هـ)، الناشر: دار الفكر، بيروت – لبنان، الطبعة: الأولى، ١٤٢٢هـ-٢٠٠٢م.

١٨- مفهوم البدعة، د. عبد الإله بن حسين العرفج، دار الفتح-الطبعة الثانية-١٤٣٣هـ-٢٠١٢م.

١٩- منهاج السنة النبوية في نقض كلام الشيعة القدرية، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني (المتوفى: ٧٢٨هـ)، المحقق: محمد رشاد سالم، جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية، الطبعة: الأولى، ١٤٠٦ هـ - ١٩٨٦ م.

٢٠- المواهب اللدنية بالمنح المحمدية، أحمد بن محمد بن أبى بكر بن عبد الملك القسطلاني، أبو العباس، شهاب الدين (المتوفى: ٩٢٣هـ)، المكتبة التوفيقية، القاهرة- مصر.

٢١- الموضوعات، جمال الدين عبد الرحمن بن علي بن محمد الجوزي (المتوفى: ٥٩٧هـ)، ضبط وتقديم وتحقيق: عبد الرحمن محمد عثمان، المكتبة السلفية بالمدينة المنورة، الطبعة: الأولى، ١٣٨٨ هـ - ١٩٦٨ م.

٢٢- نيل الأوطار، محمد بن علي بن محمد بن عبد الله الشوكاني اليمني (المتوفى: ١٢٥٠هـ)، تحقيق: عصام الدين الصبابطي، دار الحديث، مصر، الطبعة: الأولى، ١٤١٣هـ-١٩٩٣م.

# پێڕست



موسوڵمانانی جیهان لە مانگی پیرۆزی مەولوودا به دووبەرەکیی و، تۆمەتبارکردنی یەکدیی و، بەرجەستە کردنی فەلسەفەی ڕق و کینە بەهۆی بوونی ڕای جیاواز لەسەر ڕەوابوونی یادی مەولوود گیان و ڕەوانی پاکی پەیامبەر ئازار ددەن و دڵی گەورەی غەمباران دەکەن.

- با ئێمە پێکەوە خۆشەویستیی خۆشەویستمان ﷺ لە مانگی مەولوودا بکەینە هەوێنی ئەوین و، ژیوەری بەیەکگەشتن و سێوەری لەیەکگەشتنمان.
- با پێکەوە ناوی بەرز و بەڕێزی ئەو سەروەرو تاجی سەرە بکەینە ژیلەمۆی بووژانەوەی دوای ژاکان و، نزیکبوونەوەی دوای پەرتەوازەییمان.
- با ئەوینی ئەو ئەویندارە بکەینە سەوقات و دیاریی بۆ ڕەوانی پاک و بێگەردی.
- با بۆ ساتێکیش بێ ببینە زەردەخەنە بۆ لێوی لێوبەباری، دڵارا بۆ دڵی غەمباری، چیتر نەبینە ژان و ئازاری، بەڵکو شادمان بین بە دیداری "هەزار سەڵات لە ڕوخساری"

**ئەلا ئەی فەخری عالەم "رحمة للعالمین" ی تۆ**
**لە دەرحەق ناکەس و کەس ڕەحم و لوتفی ئێوە یەکسانە**




نرخی (٢٠٠٠) دینارە



ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا
ARA Media Center
www.aramediacenter.com
info@aramediacenter.com